## لەم ژمارەیەدا




الاشراف الفني : ص . ع



رۆشـــنبیری نـــوێ

گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی مانگانەیە

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

سەر نووسەر

مصلح مصطفی جەلالي

# نۆیەمین کۆنگرەی هەرێمانەی
## حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتیراکی

**● لە ماوەی نێوان ٢٤ – ٢٧ی حزیراندا نۆیەمین کۆنگرەی هەرێمانەی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتیراکی بەسترا کە لەپێشەوە هەڤاڵ صدام حسین ئەمین سری سەرکردایەتیی قوتری بە ووتارێکی رێپێشاندەری پوخت کۆنگرەکەی کردەوەو گوتی :**

«ئێوە لەم دەورەیەدا و لەبەر بارو رۆژگاری تایبەتی ی ئەمڕۆی شۆرش‌و عیراقی مەزن و بەهۆی ئەو زنجیرە تاقیکردنەوە تایبەتیانەی کە پێدا تێپەڕ بوون بەڕاستی‌و بە رووێکی گشتی ئێوە بە پێشڕەوی حیزب‌و سوار چاکانی گەلی مەزنمان‌و دڵی زیندوو و چاوی نەخەوتووی گەل دەژمێردرێن ، ئێوە ئەو دەنگەی گەلن کە نابێ هەرگیز کپ بکرێت کاتێ کە پێویست بە قسەی راست دەبێت‌و نابێ هەرگیز نزم بێت کە پێویست وا دەخوازێت دەنگەکە دەنگێکی دلێرو بەهێزو ئاشکرا بێت .»

دوای ئەوەی هەڤاڵی سەرکردە ووتەکەی خۆی تەواوکرد کۆنگرەکە دەستی بە کارو کردەوە کردو کەوتە ساغ کردنەوەی ئەندامەتی ی ئەندامان‌و کۆڵینەوە لە راپۆرتی سیاسی ی ناوەندی‌و گشتی کە سەرکردایەتی ی قوتری ی حیزب پێشکەشی کرد بوو . راپۆرتەکەش کە لە پێشەکی یەك‌و هەشت بەش پێك هاتووە باسی مەسەلە بنەڕەتەکانی نیشتمانی‌و نەتەوەیی دەکات ، لەوانە : تەجرەبەی ناوەخۆی حیزب‌و شۆرش لە ساڵانی نێوان هەشتەمین کۆنگرەو نۆیەمینی ئەم جارەداو تەجرەبەی گۆڕانکاری یە



نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌یەکان‌و پەرەپێدانی گشتی‌و بیناسازیی ئیشتیراکی‌و گۆڕانکاری‌یە کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌یەکان .

## شەڕی دوژمنی ئێرانی

راپۆرتی سیاسی بەشێوەیەکی تایبەتی بایەخی بەو جەنگە نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌یە دا کە گەلەکەمان دژی دەستدرێژیی کەرانی ئێرانی‌و هاوپەیمانی سەهیۆنی‌و دەوڵەتی‌و جگە لەو خاینەن‌و بەناو عەرەبانەی کە لە پشتیانەوە وەستاون کردوویەتی .

هەروەها بە وردی‌و قووڵی لەلایەنی فیکری‌و سیاسی‌یەوە لە تەقەلای هەندێ تاقمی گومان لێ کراوی کۆڵیەوە کە لە ژێر پەردەی ئاییندا پیلان دەگێڕن لە دژی نەتەوایەتیی عەرەب‌و بزووتنەوەی شۆرشی عەرەبی‌و مەسەلەو پەیوەندی‌یە نەتەوەیی‌و دەوڵەتی‌یەکان .

## راپۆرتێکی گشتلایی

کۆنگرەکە لە ماوەی وتووێژی تێروپڕو قووڵ‌و کوڵینەوە لە راپۆرتی سیاسی ئەوەی دووپات کردەوە کە راپۆرتەکە کەوا سەرکردایەتی ئامادەی کردبوو ئاستێکی بەرزو قووڵ‌و پێگەیشتووی هەیە بە شێوەیەك کەوا توانیویەتی بە ووردی‌و گشتی کۆڵەکەکانی تاقیکردنەوەی پێشوو و ئەم کۆنگرەیە بگرێتە خۆی‌و دەست‌نیشانی ئەو سەرکەوتن‌و گەشەسەندنە بکات کە لە ساڵانی نێوان هەردوو کۆنگرەدا هاتونەتە دی .

هەروەها کۆنگرەکە ئەو دەورە گەورەو لێهاتووەی سەرەکی تێکۆشەر هەڤاڵ صدام حسین‌ی پێشان‌دا کە لە سەرکردایەتیی کردنی کاروانی نیشتمان‌و نەتەوەدا نواندوویەتی و بەهۆی نەخشەو بیرو بۆچوونە راستەکانی‌و ئازایەتی‌و نەبەزی‌ی ئەم سەرکردەیە جۆرەها دەستکەوتی گەورە گەورە بۆ گەل‌ونەتەوە هاتەدی .

## یەکیەتی نیشتمانی

کۆنگرەکە ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی هەڵسەنگاند کە لەبارەی پتەو کردن‌و چەسپاندنی یەکیەتی نیشتمانی‌یەوە لە وولات هاتوەتەدی‌و کە مەسەلەی کورد بە ئاشتی‌و دیموکراتیانە چارەسەرکراوە . . کە ئەمڕۆ یەکیەتی نیشتمانی راستەقینەیەکی چەسپاوەو ئوتونومی گەلەکەمان لە ناوچەی کوردستان حاڵەتێکی رەسەن‌و خولقێنەرەو تاقیکردنەوەی نیشتمانی تێرتر دەکات‌و ئەڵقەی یەکیەتی‌ی نیشتمانی بەهێزتر دەکات .

ئەو پیلان‌و داوو گێرەشێوێنی‌یەی لە دژی ئەم دەستکەوتە گەورەیە دەکرێت کەوا ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی ئیمپریالزم‌و زایۆنیزم‌و هی‌دی . . و هەندێ خواروخاینی حوکمڕانی عەرەب کە هەرچی هەستونەستی نەتەوەیی بێ نەیان‌ماوە . . لەگەڵ حوکمڕانانی گومان لێ‌کراوو رەگەزپەرست‌و چاوچنۆکانی تەهران ئامادەیان دەکەن‌و رێکیان دەخەن هەموویان لەسەر بەردی یەکیەتی نیشتمانی ووردو خاش دەبن . . هەروەها رووبەرووی باوەڕێکی بەتین دەبن بە عیراقێکی سەربەستی سەربەخۆی بە

هێز و گەشاوە کەوا رەنجی هەموو رۆڵەکانی ئەم عیراقە لە ژێر ئاڵای صدام حسینی سەرکردەدا یەك دەگرێتەوە بۆ چەسپاندنی دەستکەوتە نیشتمانی و کۆمەلایەتی یەکانو هێنانە دی سەربەستی و کامەرانی بۆ گەل .

## هەڵبژاردنی سەرکردایەتی

پاش ئەوەی کۆنگرەکە دوورودرێژ لە راپۆرتی ناوەندی کۆڵی یەوەو وتوویژی لەسەرکرد وبەراسپێری و تێبینی بە پێزی کرد . کۆنگرە بەگشتی دەنگەکان بریاری لەسەرداو داینا بە پرۆگرامو رابەری خەباتو چالاکی ی حیزب و شورش لە ماوەی قوناغی داهاتوودا .

بە پێی ی پێرەوو نەریتی دیموکراتیانەی حزب کۆنگرەکە سەرکردایەتیی هەرێمی حیزبی بە دەنگدانی نهێنی هەڵبژارد پاشان سەرکردایەتیی هەرێم لە ناو خۆیاندا کۆبوونەوەو سەرلەنوێ باوەری تەواویان بە سەرکردەی مێژوویی صدام حسین تازەکردەوەو سەرلەنوێ بە (ئەمین سر و سەرکردەی هەڵکەوتووی حیزبو شۆرشیان هەڵبژاردەوەو هەڤاڵ عزة ابراهیم بە جێگری (ئەمین سر) هەڵبژێردرایەوە .

رۆشنبیری نوێ

# لەیادی «١٤» ساڵەی شۆرشی «١٧»ی تەموزدا

چواردە ساڵ لەمەوبەر ، عیراقو نیشتمانی عەرەب ، بە دۆخێکی یەجگار ئاڵۆزو سەخت و گران یێدەپەرین . . دووچاری دەستی باری ناخۆش و پەرێپەری و تێکشکان بووبوون . . بەتایبەتی نێشکانی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧و دوژمنداریی و هەرەشەی درندانەی زایۆنی رەگەزپەرستو دوژمنانی ئازادی و سەربەستی و سەربەخۆیی .

ئەوەبوو ، رژێمی عارف ، بە هەوەستو ئارەزووی خۆی یاری بە چارەنووسی عیراقو سامانو داهاتی گەلی دەکردو ، میللەت و گشت هێزەنیشتمانی یەکانیش ، بەدەست زەبرو زەنگی کاربەدەستانی رژێم دەیان ناڵاند ، تا ئەو رۆژەی هێزی گەلو ئیرادەی جەماوەر ، بەسەرکردایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ، لەبەربەیانی حەڤدەی تەمووزی ساڵی ١٩٦٨ دا شۆرشی بەرپاکردو لاپەرەیێکی نوێی لە مێژووی وڵاتو نیشتمانی عەرەبدا ، پێش چاوخست .



دکتۆر جواد مرزوق

شۆڕشی تەمووز ، بەراستی ، نیشانەیێکی دیار لە مێژووی گەل‌و وڵات پێك‌دێنێت . . دروستکەرانی شۆڕشیش ، کەسەر بڵند توانیان مەشخەڵی دوارۆژێکی پڕشنگدار هەڵبگرن . . بەرەو پێشکەوتن‌و سەربەستی‌و سەربەخۆیی ، ڕێبازە پێشکەوتووەکە بکەونە ڕەوت ، دوای ئەوەی کە دەیەها ساڵ لە تێکۆشانێکی سەخت‌و بەردەوامدا ، گیانی پاکی خۆیان لەم ڕێگایەی پڕ لە ئێش‌و ئازارو ئاڵۆزو قوربانی‌دان ، بەخش‌کردبوو .

شۆڕشی ١٧ – ٣٠ ی تەمووز ، هەر لەسەرتاوە ، ڕێرەوە نەتەوە پەرستە سۆشیالیستی‌یە یەکگرتن‌خوازەکەی خۆی بۆ جەماوەر ڕاگەیاندو بەکردەوەش ساغی کردەوە کە هەرسێ دروشمی یەکێتی وسەربەستی‌و سۆشیالستی بەیەکەوە بەستراوەو لەیەکتری جیانا کرێنەوە . بەڵێ . . شۆڕشی تەمووز ، هەر لەیەکەم ڕۆژی بەرپابوونیەوە ، سیاسەتێکی ڕوون‌و ئاشکرای لەمەیدانی دەرەوەو نێودەوڵەتان بووە . . سیاسەتی لەباری بێ‌لایەنی‌و بەهیچ لایەکدا نەشکاندنی بە گۆشەیەکی سەرەکی داناوەو توند بە ناوەرۆکی ڕزگاریخوازو دیموکراتیانەی ڕێبازەکەیەوە گرێ داوە کە دژی سیاسەتی نۆکەران‌و ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستانو . . دژی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی‌و جیاوازی نێو نەتەوەکانە .

شۆڕش لەم ئاستەوە ، پەیوەندی بەتینی لەگەڵ گەل‌و وولاتان‌و بزووتنەوە رزگاریخوازەکانی جیهان بەست‌و بەپێی توانای ، یارمەتی و پشتگیری کردوون .

شۆڕشی مەزنمان ، لەماوەی چواردە ساڵی تەمەنیدا ، دەسکەوتی مەزن‌مەزنی وەدی‌هێناوە .

هەر لە سەرەتاوە ، شۆڕش ، لەبەر ڕۆشنایی نەخشەیێکی زانستانەو ووردا ، ڕووی‌کردە ئاڵۆزترین مەسەلەی نێو عیراق – مەسەلەی کورد – و دانی بە وجودی ڕەوای نەتەوەیی کورددا ، نا . . وە بەیاننامە مێژووەکەی یانزەی ئازاریش ، وەك چوارچێوەیێکی ڕاست‌و دروستی چارەسەرکردنی ئاشتی‌و دیموکراتیانەی مەسەلەی کورد ، بانگی بۆ داهێشت ، کە بەهۆیەوە ، پەیوەندی برایانەی نێوان هەردوو گەلی وڵات قایم‌و پتەوتر بوو و ، خرایە مەودایێکی باشتر . . یەك خەبات . . یەك هیواو خواست . یەك چارەنووس .

شۆڕش ، لەوکاتەی ڕووبەڕووی مۆنۆپۆلە چاو چنۆکەکانی نەوت بووەوە لەیەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢دا ، بنکەیەکی زانستانەو قایمی وەبەرهێنانی ڕاستەو خۆی نەوتی گرتە دەست ، هیواو ئاواتی دەیەها ساڵەی گەلی عیراق وەدی‌هێنا .

ئینجا شۆڕش کەوتە خۆیەوەو رۆژ دوای رۆژ زیاتر هەنگاوی بەرەو پێشتر دەناو دەسکەوتی مەزنی بۆ تێکرا جەماوەری ولات وەدی هێنا . یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵو دەسکاری کردنە یەك لەدوای یەکەکانی ، هەنگاوێکی تر بوو بۆ پێشەوە هاوێژراو ئەوەندەی تر جیاوازی لادێو شاری کەم کردەوەو لەبنی هێنا . . رەگ‌و ریشەی دەرەبەگایەتی هەڵکێشا .

دەرچوونی هەردوو یاسای ئەنجومەنی نیشتمانی و یاسادانانی ناوچەی کوردوستان ، هەنگاوێکی تر بوو کە شۆڕش هاویشتی بۆ ئەوەی مەودای ژیانی دیموکراتیانە فراوان بیێو خەڵك نوێنەر بۆ هەردوو ئەنجومەنەکە هەڵبژێرن .

شۆڕشی ئابووریو کۆمەلایەتیو رۆشنبیری . . بنیات‌نانی مرۆڤی عیراق لە بوارەکانی زانستیو کۆمەلایەتی‌دا . . ئینجا بزووتنەوەی ئاوەدان کردنەوەو ژیانی بەختەوەری بۆ هاولاتیان ، دەسکەوتی مەزنی شۆڕش‌بوون . . ئەمەو ، سەرەڕای دەرکردنی دەیان یاسای‌تر . . لەنەهێشتنی نەخوێندەواریو خوێندنی بە خۆڕاییو یاسای خانەنشینو خێزانو پەککەوتووان . . دامەزراندنی رێکخراوە میللیو پیشەییەکان . . زیادکردنی موچەو باشکردنی باری ژیانی هاولاتیان . . هتد .

شۆڕش شانازی بەوە دەکات کە دەسکەوتێکی نیشتمانی و نەتەوەیی گەورەی بۆ ولات وەدی‌هێناوە ئەویش بنیات‌نانی سوپایێکی نیشتمانی‌یە کە شایەنی راپەڕاندنی ئەرکەنیشتمانیو نەتەوەکانیەتی .

سوپاکەمان لەسایەی شۆڕشو سەرکردایەتی حزب‌دا ، بۆتە جێگای شانازی گەلو نەتەوەی عەرەب کە بە چاوی هیواوە تیێی دەنوارێت بۆ ئەوەی ئەرکە نەتەوەییو نیشتمانییەکان راپەڕێنێت‌و خواست‌و ویستی جەماوەر وەدی بهێنێت .

– سلاو لەیادی ١٤ ساڵەی شۆڕشی نەتەوەیی سۆشیالیستی ١٧ – ٣٠ی تەمووز .

– سلاو بۆ سەرکردەی گەل ، سەرۆکی تێکۆشەر هەڤال/صدام حسین .

## بەبۆنەی جەژنی چواردەهەمی

شۆڕشی رێگەی نوێ کە حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالست لەعیراق داپچەسپاند ، دووبارە کردنەوەو لاسایی شۆڕشە باوەکانی پێشووتر نیە ، چونکە لەسەرەتاوە خۆی بە جعزو چوارچێوە حازربەدەست‌و ووشکەکان نەبەستەوەو بەشێوەو شێوازی دوور لە قەناعەت‌و رەزامەندیی گەل سەودای لەگەڵ ژیانو گیروگرفتە زۆرەکان نەکرد ، بەڵکو پێڕەوو بەرنامەیەکی وای هەڵبژارد کە زیندوویێت‌و کاریگەریی شۆڕشگێڕانەی هەبێت بۆ ئەوەی لەهەردوو مەیدانەکانی شۆڕشی راستەقینەدا پێشکەوتن بەدەست‌بهێنێ ، ئەم دوو مەیدانەش یەکەمیان داڕشتنی فیکریو تیوریی ساغو لەگەڵ واقیعی هەست‌پی‌کراوو باری مەوزووعیو خۆیی‌دا گونجاو ، دووەمیشیان تەتبیقێکی هاوسەنگ‌و بەهرەدارانەو هونەرمەندانەی بەرنامەو نەخشەکانی شۆڕش لە هەموو کۆڕو مەیدانێکدا .

لەبەر هەندێ ، ئەو رێگە نوێیەی کە شۆڕشی مەزنی ١٧–٣٠ی تەمووز دایهێناو پشت‌بەستنی بەپێڕەوو پروگرامو نەخشەی‌کاری شۆڕشگێڕیی هەمیشە تازە ، هێزێکی گەورەی پی‌بەخشی تاکو بەردەوام بتوانێ بەووردیو بەروونی تەعبیر لە

# شۆڕشی ١٧ – ٣٠ ی تەممووزەوە

## سەرەتای رێگەی نوێو داستانی گەورەو سەرکەوتن و دەستکەوتی مەزن

دوای سەدان سالّی بزربوونو داپچڕاویو پەرش‌وبلاوی لەسێبەری قورمی شالاوی بێگانەدا ، لەو سەردەمە تاریکەدا کە تالاوی دواکەوتن‌و بێ‌هیوایی لە لالێوی گەلە مەزنەکەماندا ئەمەیی ، دوای ئەم نەهامەتی‌و ئەشکەنجەو تاریکی‌یە شۆڕشی ١٧ – ٣٠ ی تەممووزی سالّی ١٩٦٨کە حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالست سەرکردایەتیی کردو سەرکەوتووانە تەقانییەوە هاتە مەیدان بۆ ئەوەی سەرەتای سەردەمێکی تازە لە ژیانی عیراق‌و خەلّکی عیراقدا دروست‌بکات ، بۆ ئەوەی رێگایەکی فراوان تەخت‌بکات لەبەردەم بینای شۆڕشگێڕانەی یەکێتی‌خوازی بەهێزی عیراقدا تا بی‌بە بازوویەکی ئاسنیی زەبروەشێن‌و لێهاتووی هەلگرتنی ئۆبالّی مێژوویی نەتەوەیی‌و نیشتمانی خۆی تا وابکات نەتەوە پێ‌بنێتە زەمینەیەکی پێشکەوتنی وەها کە لەمەوە ئامانجە رزگاری‌یەکانی خۆی بەدی‌بهێنێت‌و پێویستیەکانی یەکیەتیی نەتەوەیی دابمەزرێنێت‌و گەشانەوەی کۆمەلایەتی‌و شارستانانەو زانستی بهێنێتەدی .

خواست‌و ویست‌و بەرژەوەندەکانی گەل بکات لەچوارچێوەی بەخەمەوەبوونی سەرکردایەتیی بەرزی حزب‌و شۆڕش بەسەرۆکایەتیی هاوڕێ‌ی فەرماندەی هەلکەوتوو صدام حسین بۆ نەپسانەوەو مەحکەمتر کردنی یەکگرتنی خەبات‌و یەکانگیری‌و یەکیەتی لەکۆمەلّی نوێی‌نداو کارلێك‌کردنێکی زیندووی جەماوەر بۆ هەل‌قولاندنی ووزەی بەهرەداری بەملیۆنان کەس لە رۆلە سەربەرزەکانی عیراق . . بەرەو مەزنایەتیی عیراق‌و گەشانەوەی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و زانستی‌و شارستانێتی عیراق .

لێرەوە کارێکی سەیرو لەخەلّك بەدەر نەبوو کە عیراق – بەهۆی شۆڕش‌و قوولّیی ئامانجەکانی‌و رەسەنیی ناوەرۆکەکانی‌و پرۆگرامی مەبدەئیی سەرکردایەتی‌یەکەی – راگوێزانێکی خێراو هاوسەنگ بەخۆیەوە ببینی‌ لە باری دواکەوتن‌و لاوازی‌و هەژاری‌یەوە بۆ بارێکی تەواو پێچەوانە . ئەوەتا لەرۆژانی سەرەتای شۆڕشەوە تا دی‌ سەرکەوتن‌و دەستکەوت لەمەیدانی ناوخۆو دەرەوەدا زۆرتر دەبێت ، بەماوەیەکی کەم‌و بەرەبەجێکی بەردەوام شۆڕش توانی سەرلەنوێ‌ بینای یەکیەتیی نیشتمانی دابمەزرێنێتەوەو لەخلّتوخاش‌و کردەوەی خراپ رزگاری بکات ، هەروەها داوو پیلانی دەست‌خستنە ناو کاری ناوخۆی عیراق هەلّبڕی‌و شۆڕش گەیشتە ناو دلّو دەروونی هەموو عیراقی‌یەك ، ئەمەش بەروونو رەوانی‌و بەپاکی‌و رەسەنی لەهێزو زەبری شۆڕش‌دا دەردەکەوی‌ کە لەئەیلولی سالّی ١٩٨٠ بەرپەرچی دەستدرێژیی ستەمکارانەی دوژمنی رەگەزپەرستی فارسی دایەوە و تا ئێستا وەکو شوورەی پولا بەرامبەر هەرەشەی دوژمن وەستاوە ، هەروەها لە یەکانگیریی بێ‌نموونەی شورش‌و جەماوەرو نێوان سەرکردەو گەل بەتەواوی‌دا خۆی دەنوێنی‌ ، کە ئەمەش زیاتر لە کۆڕی شەڕو بەرەی سەرکەوتنەکانی سوپادا ئەچەسپێت کە ناهێلن دوژمن سەر بە عیراق دابنەوێنێت‌و خاکی پیرۆزی .عیراق پیس بکات .

عیراق بەعس دوای هەلّهاتنی خۆری شۆڕشی ١٧–٣٠ تەممووزی سالّی ١٩٦٨ بوو بەخاکی سەرکەوتنی گەورە گەورەو جەنگەگای داستانی بێ‌نموونە . هەر بەم جۆرە شۆڕش بەسەر کۆمپانیاکانی نەوتدا سەرکەوت‌و بەخۆمالّی‌کردنی نەوت خێرو خێراتی عیراق لەقوڕگی کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانی جیهانی دەرهێناو سامانی نیشتمانی لەچنگی بێگانە رزگارکرد ، بۆ یەکەم جار لەعیراق تازەدا یەکسەرو بەدەستی رۆلّەی نیشتمان سامانی ناو زەوی نیشتمان بەرهەم‌هێنراو پتەوی باری ئابووری سەربەخۆیی عیراق زیاتر چەسپاندو بەهێزکردو ماوەی دا کە نەخشەو پرۆگرامی پڕ لە ئاواتی پەرەسەندنی گشتیی نەتەوایەتی بخاتە کارو

هەنگاوی گورجی لەرێگای تەواوکردنی بنیاتنانی بنکەی ماددیو تەکنولوژی کۆمەڵی نویٚ هەڵهێناوە. پیشەسازی لەلایەنی چەندیو چۆنیتی‌یەوە پێش کەوتووەو شۆڕش یاسای چاککردنی کشتوکاڵی راستەقینەی تەواو بەجی گەیاندو ژمارەیەك پرۆژەی کشتوکاڵی گەورەی دامەزراند، بەسەدان گوندو کۆمەڵگای هاوچەرخی بۆ لادێیەکان دانا بەبێ پارە. لەماوەی ئەم چواردە ساڵەدا دەیان پرۆژەی ستراتیجی ی زیندووی تەواوکردووە کە جەستەی ئابووری ی نیشتمانی پەرەپێ دەدەنو ئاسوگەی فراوان لەبەردەم گەشەکردنو پێگەیشتنی ئابووری‌دا دەکەنەوە. هەروەها دەستی کردووە بەدانانی پەیکەری داچەسپاو لە رێگەوبانو پردو بەندو بەستو کۆگای ساردکەرو بەستەنی.

شانبەشانی پەرەسەندنی خێرای ئابووری پێگەیشتنێکی هاوسەنگی لایەنەکانی کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریو فیکریش روویداو پرۆگرامی پەرەپێدانی مرۆڤانە بووە یەکێك لە گەورەترین ئەرکەکانی شۆڕشی تەمووزی مەزن. ئەوەبوو ژمارەی قوتابخانەو ژمارەی قوتابیانی هەموو قۆناغەکانی خوێندنو جۆرەکانی خوێندن دووچەندانەو زیاتریش زیادی کرد. خوێندنی بێ پارە چەند ساڵێکە جی بەجی کراوەو لە قوتابخانەکانی سەرەتاییدا بووەتە ئیلزامی، ئەمەو ژیانی کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری شانبەشانی بەرزبوونەوەی داهاتی خەڵكو چاکی باری ژینیان بەرز بوەتەوەو ژیانی شارستانەتیو هاوچەرخانە بلاوبوەتەوەو پەیوەندی راستورەوانی دیموقراتیو مرۆڤایەتی کەوتوەتە نێوان رۆڵەکانی کۆمەڵی نوی‌وە، لە کارکردنو خوێندنو خزمەتە بنەرەتی‌یەکانو لەسەربەستی ی ناو چوارچێوەی گشتی رەووشتو نرخەکانی شۆڕشو یاساکانیدا هاونیشتمانان هەموو وەکو یەكو یەکسانن.

هەر بەم جۆرەش بزووتنەوەی رۆشنبیریو هونەری بەرز لەعیراقدا بووژایەوەو گوڕی بەست، بەدەیان کتێبخانەو خانووی بلاوکردنەوەو شانۆو تیپی هونەری شارەزا دامەزرا، شۆڕش گەلی کۆمەڵەو دەزگای رۆشنبیریو هونەری بۆ خزمەتی مرۆڤو کامەرانی ی مرۆڤ پێك‌هێنا. بۆیە مەیدانی فیکرو سیاسەتو ئابووریو کۆمەڵایەتی لەژێر سێبەری شۆڕشدا راپەرینێکی گەورەی بەخۆیەوە دی، بۆیە عیراق بووەتە قەڵایێکی پۆڵابەند لەرووی هەموو دوژمنو پیلانگێرێك بەئیمپریالیستو زایۆنستو رەگەز پەرستە فارسەکانەوە.

ئابەم جۆرە شۆڕشی ١٧ی تەمووز و سەرکردایەتی‌یە مێژووییە هەڵکەوتەکەی ئیسپاتی کرد کە توانایەکی تەواوی هەیە بۆ فەرماندەیی گۆڕانکارە گەورەکانو هێنانەدیی ئاسوودەیی ژینو سەربەرزیو سەربەستیو پێویستیەکانی بەهێزبوونی گەل، بۆ ئەوەی ئاغای ماڵی خۆی بێتو بکەوێتە بنیاتنانی دواڕۆژی گەشی نەتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ هێزێکی خەشیم با زۆر بەتواناو زەبربەدەستیش بێت بتوانی بەرەنگاری رەوتی شۆڕش بێت یان لەملاو لەولا گیرەشێوێنی بکاتو کار لە کاروانی بەردەوامی بینای گشتی بکات کە ئەمڕۆ بووەتە رەمزێکی گەورەی سەربەرزیی عیراقو رێگەی پەرەسەندنی هێزی عیراقو پتەوی ی عیراق.

ئیتر بەقەد دەستکەوتو سەرکەوتنی زۆرو نەپچڕاوەی شۆڕش لەماوەی ئەم چواردە ساڵەدا لەهەموو کۆڕو مەیدانێکی ژیاندا پیلانی ئیمپریالستو زایۆنیستان لەهەرمێن‌دا بووە، شانبەشانی هێزی بەدکارانو گومانبارو داخ‌لەدڵان کە ویستوویانەو دەیانەوێت جووڵانەوەی شۆڕش لە هەندێ سنووردا بووەستێنن بۆ ئەوەی لەتوانادا بێت لەرێ لایبدەنو لەدواییدا شلو شێواوی بکەنو نەتوانێت بەرەو ئامانجە پیرۆزەکانی هەنگاو هەڵێنێت.

دوای ئەوەی هێزە دوژمنەکان بێ‌هیوا بوون لەوە کە رەورەوەی شۆڕش لەسنوورێکدا بووەستێنن هاتن ئاوەڕۆی هەڵسوکەوتو قەوماوەکانی ئێرانیان بەرەو رێگەیەك برد بەڵکو لەم رێگەیەوە بەو ئامانجە بگەن کە لەماوەی سێزدە ساڵدا نەیانتوانی پێ ی بگەن.

ئەمەبوو، هەر کە خونکارانی تازەی ئێران جڵەوی حوکمڕانییان گرتەدەست هەروەکو هەمووده‌یزانین دەمیان لە شۆڕشی عیراق کردەوەو کەوتنە هەڵڕشتنی چاووڕاوو تەمای ستەمکارانە بەرامبەر بەعیراقو هەرێمەکانی کەنداوی عەرەب، هەر بەو گیانی ئیمپراتور پەروەریو پەل هاویشتنە رەگەزپەرستانەی شای جاران کەوتنە هەڵپەو جموجووڵ. ئەم کارە بەوە گەیشت کە لە ٤ی ئەیلولی ١٩٨٠دا دەستدرێژی سوپایی بکەنە سەر سنوور و شارەکانی عیراق ئیتر وای لێ‌هات کە خونکارە تازەکانی ئێران خواستی هێزەکانی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمیان بەجی گەیاند.

پاش ئەوەش کە شۆڕشو سەرکردایەتی‌یە مێژوویی‌یە ری‌ئاسە ئازاکەی شۆڕش ناچارکران بێنە مەیدانی بەرەنگاریو مەیدانی شەڕی پاراستنی سەربەرزییو ئابرووی نیشتمانو خاکی عیراق خۆشەویستو پاراستنی گەلو دەستکەوتەکانی، سوپای عیراقو گەلی عیراق هەموویان بەیەك‌جار هەستانە سەر پێ ی



لەپشت سەرکردەی خۆیان شیری هەقیانەتیان هەڵکێشاو کەوتنە خاپوورکردنی ئاواتی دەستدرێژکەرە فارسەکانو پەڵەختتی ئەدەوات‌و کەرەستەی شەڕفرۆشی‌یان ئنجا شەڕ پەڕیەوە ناو قووڵایی خاك‌و شارەکانیان . لە ماوەیەکی زۆر کورتدا سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بەدەست هێنرا .

ئەو سەرکەوتن‌و ئازایەتی‌یە نایابەی سوپای عیراق پیشانی‌دا وێنە دانەوەی تەواوی باری پێشکەوتووانەی عیراقە لە سایەی شۆڕش‌و سەرکردایەتی‌ی بەرزیدا بەتایبەتی لەمەیدانی دروستکردنی مرۆڤی تازەی خاوەن توانایی بەخشین‌و قوربانی‌دان‌و خۆبەختکردن لەپێناوی نیشتمان‌و مافی نەتەوەدا .

ئیتر شۆڕش زەبرێکی بەژانی سرەواندە دوژمنان‌و ئەوانەی داویان بۆ عیراق ئەنایەوەو پشتی ئاواتی پەلهاویشتن‌و پیلانی ئیمپریالیزم‌و زایونیزم‌و فارسی شکاند ، لەشکری قادسیەی نوێ بەسەرکردایەتی‌ی سەرلەشکری بەرزی بەتەجرەبەو ئازایی بێ‌نموونەی سەرۆك صدام حسین سەری نیشتمان‌و نەتەوەی بەرزکردەوە .

نەك هەر لەمەیدانی شەڕدا ، بەڵکو لە مەیدانی پەرەپێدان‌و پێشکەوتنیشدا کە هەوڵی وەستانی ڕێڕەوەکەیان ئەدا ، لەو مەیدانەشدا عیراق توانی بەردەوام هەنگاوی بەرەوپێشتر هەڵێنێ‌و رۆڵەکانی عیراق بەرپرسیاریی خۆیان ئەزانن ، زیاتر رەنج‌ئەدەن‌و لە بنیاتنانی پرۆژەو بەگەڕخستنی مەکینەی ئابووری‌و بەردەوامی ژیانی رۆژانەی سروشتی لەهەموو شوێنەکاندا بێ ماندووبوون کارئەکەن .

رووداوو هەواڵەکان‌و تاقیکردنەوەکان بۆ هەموو رۆڵەکانی عیراق‌و جیهانیان سەلماند کە شۆڕشی ١٧ – ٣٠ی تەمووزی مەزن لە هەر جەنگێکی گەورەدا کە بەسەری‌دا بسەپێنرێ سەربەرزانەو پتەوتر دەبێت‌و پرۆگرامی بیروباوەڕی‌یەکانی قووڵتر دەبێت . چونکە بەراستی شۆڕش جەنگی خەباتی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و داستانی گەورەی سەرکەوتن‌و دەستکەوتی مەزنە .

لێرەوە ئەتوانین بڵێین کە شەڕفرۆشی‌و دوژمنایەتیی ستەمکارانەی فارسی رەگەزپەرست هەرچەند درێژە بکێشێت ئەبێتە مایەی تێکشکانی مەکینەی دەستدرێژیی‌و دوژمنایەتی‌ی فارسی لەلایەکەوە و پەرەسەندنی هێزی سوپای‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و مەعنەویی عیراق لەلایەکی ترەوە .

سەرکەوتنەکانیشمان . توانای بێ‌نموونەشمان لەپاراستنی دەرگای رۆژهەڵاتی نیشتمانی گەورەی عەرەبدا . رووی راستی ئەو بارە ئەگەیەنێت کە عیراقی سەرکەوتوو و خاوەن هێز دەتوانێ پێشکەش خەباتی رزگاریخوازیی نەتەوەی بکات لەشەڕی گەورەی پیرۆزماندا دژی زایۆنیزم‌و قەوارەی زایۆنیزم لەفەلەستینی ئازیزدا .

بەم شێوەیە شۆڕشی مەزنی تەمووز ساغی کردەوە کە لە هەموو دوژمنان‌و لەهەموو نەهامەتی‌و تەنگانەیەکدا بەهێزترە . شۆڕشێکە نوێیە لەتەرزدا ، شۆڕشێکە بۆ کامەرانی‌ی مرۆڤ‌و پێشکەوتنی مرۆڤ کارئەکات . شۆرشی هەموو گەلەو برواداری پێشکەوتن‌و یەکیەتی‌ی هەموو گەلە .

پایەداربێ شۆڕشی ١٧ – ٣٠ ی تەمووز .

پایەداربێ سەرکردەی مەزن . فەرماندەی مێژوویی صدام حسین .

* * * * * * *

# تەمەنی شۆڕش و ڕەوتی ئۆتۆنۆمی . . .

هەر لە ڕۆژی یەکەمی سەرهەڵدانی شۆڕشی ١٧ – ٣٠ ی تەمموزی پێشکەوتنخوازەوە ، هەوڵێکی دڵسۆزانەو زانستیانە درا بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی بنەڕەتی بۆ (کێشەی کورد) . . ئەوەبوو ئەم هەوڵە بێ‌ووچانە لە بەیاننامەی (١١)ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠دا خۆی‌نواند . . ئەمەیش خۆی‌لەخۆی‌دا هەنگاوێکی چەسپاو بوو بۆ پتر بنج داکوتانی دۆستایەتی مێژوویی نێوان هەردوو گەلی کوردو عەرەب لەعیراقی نوێ‌دا . .

تا بەتەواوی ئەو بەیانامەیە لەقانوونی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستانی ژمارە (٣٣)ی ساڵی ١٩٧٤ دا جێ‌بەجێ‌کراو بنەکە گشتی‌یەکانی هەڵسوڕاندن‌و دارایی‌و دەسەڵاتی هەردوو ئەنجومەنی یاسادانان‌و ڕاپەڕاندنی تێدا دیاری‌کراو بەمەیش ئەم قانوونە بوو بەمایەی گۆڕڕانێکی نەوعیانەی مەزن لەکوردستان‌و لەم چەند ساڵانەی ئاشتی‌و برایەتی‌دا لەهەمان کاتیشا کەسایەتی نەتەوایەتی گەلی کوردیش لەچوارچێوەی یەك نیشتمان‌و لەپێناوی پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی‌و بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی دیموکراتی‌و پێشکەوتوودا دووپات‌کردەوە و ئەم تەجرەبەیەش لەسەرانسەری جیهانی سێیەمدا دەنگی‌دایەوە ، بەتایبەتیش لەو وڵاتانەی کە گەلی چەوساوەی کوردی تێدا ئەژێت . . هەروا دام‌و دەزگاکانی ئۆتۆنومییش ، لەم چەندە ساڵانەی تەمەنی‌دا ، گەلێ دەسکەوتی بایەخداری دەس خست‌و سەدەها پرۆژەی خزمەتگوزای‌و بەرهەمهێنانی لەبەر ڕۆشتایی (پلانی گەشەپێکردن)و (پلانی ساڵانە)دا هێنایە کایەوەو کوردستان‌و گەلی کوردی خستە بوارێکی تازەی مێژووەوە . . .

هەر لەماوەی ئەم چواردە ساڵەی تەمەنی شۆڕشی پیرۆزیش‌دا ، گەلێ هەنگاوی شۆڕشگێڕانەیش بۆ گەشەکردنی ژیانی رۆشنبیری کوردیو خێراکردنی رەوتەکەیو جێگرکردنی ووشەی پاکو رەسەنی کوردی هەڵێنرا ، سەرەڕای بڵاوکردنەوەی خوێندەوارییو چەسپاندنی گیانی وریابوونەوەو زانستو بیرو لێکۆڵینەوەی هاوچەرخانە لەسەرتاسەری کوردستانی ئازیزدا . .

بۆ یەکەمجاریش لەمێژووی کۆن وهاوچەرخی کورددا ، ددان بەبوونی گەلی کوردو بەمافی رۆشنبیریی کوردەوە نرا ، کۆڕی زانیاریو زانکۆی صلاح‌الدین – جارانی سلێمانی – وەك مەڵبەندێکی گەورەی زانین هاتە کۆڕی تێکۆشان . . بەرێوەبەرێتی خوێندنی کوردی لەراستە شەقامی گەشەسەندنی خوێندنی کوردی لەهەموو قوتابخانەکانی کوردستاندا ، بەشێوەیەکی فراوان برەوی سەند . .

لەم لاشەوە دەزگای رۆشنبیرییو بڵاوکردنەوەی کوردی دامەزراو ئەرکێکی گەورەی رۆشنبیرییو مێژوویی خستە سەر ئەستۆ . . ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیرییو لاوانی ناوچەی کوردستانیش کەوتە خۆیو لەم دەرفەتە مێژووییەدا ، هیچ دریغیەکی نەکردوە . . لەو لاشەوە ئیزگەی کوردی و تەلەفیزیونی کوردی لەجاران پتر گەشەی سەندو بەدەنگی گوێگرو بنیەری کوردەوە هات . . یەکێتی نووسەرانی کوردو کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی ماوەیان پێ‌دراو هاتنە کۆڕی خەباتو رۆشنبیرییو خزمەتی کەلەپوورو ئەدەبیاتی کوردەوە . . دەیەها گۆڤارو رۆژنامەی هەمە چەشنەی کوردی بەدەرکەوتن . . چاپکردنی هەمە جۆری بەرهەمی کوردیو بەزمانی کوردی چاپخانەکانی بەغداو کوردستانی خستە گەڕو قەدرو قیمەتی ووشەی کوردی خرایە سەرچاوان . . لەهەمان کاتیشا کاروانی نەسرەوتی نەهێشتنی نەخوێندەواری و بنەبڕکردنی رەگو ماکی نەزانین هەموو لایەکی کوردستانی تەنیەوەو خوێندیش بوو بەخۆڕایی . .

ئەمەو جگە لە دامەزراندنی دەیەها ئامۆژگەی هونەرییو ئایینیو پیشەیییو مامۆستایان . .

بەم شێوەیە رۆژ دوای رۆژ رەوتی خوێندنو بیرو زانست ، تاوێ لەکوردستاندا پەرە ئەسێنێت . . هەموویشی لە پێناوی بنیادنانی ئادەمیزادێکی نوێی نێو نیشتمانێكو ژیانی نوێ‌دا . .

بەخشش‌و داهێنان‌و کاریش هەر بەردەوامەو بەردەوامیش لەپەرەسەندنو پێشکەوتن دایە . . ! کاروانیش بەردەوام . . . !

# پەروەردەو فێرکردنو . . قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری

شۆڕشی نەمری تەموز ، بایەخێکی بەجگار گرینگ‌و گەورەی بەجیهازی پەروەردەو فێرکردن داوە . . هەر لە باخچەی ساوایانەوە بگرە تا دەگەیتە خوێندنی باڵای زانکۆیی . .

لەپلانی ساڵانی (٧٠–٧٥)دا (٧٨) ملیۆن دینار بۆ ئەم مەبەستە خەرج‌کرا ، کەچی لەپلانی (٧٦–٨٠)دا نزیکەی (٧٢٦) ملیۆن دیناری بۆ تەرخان‌کرا . . ژمارەی قوتابیان لەقۆناغە جیاجیاکانی فێرکردنا گەیشـــتـــە (٣،٧٥٢،٢٥٠) قوتابی . . . !

لــەبواری قــەلاچۆکــردنی نــەخــوێنــدەواریش‌و قوتــابخانە میللییەکان‌دا ، شۆڕش گەلێ دەسکەوتی گەورەی بەجێ‌گەیاندوە . . ئەمیش لەئەنجامی سەرپەرشتی‌کردنی راستەوخۆی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسینەوە . .

ژمارەی مەڵبەندەکانی سەرانسەری وڵاتو دەستەبەرکردنی هەموو جۆرە پێداویستی‌یەك بۆی ، گەیشتە (٢٦٧٢٩)مەڵبەند ، کە جاران تەنیاو بەس (٢٥٥) مەڵبەند بوو . . دوای ئەوەی ژمارەیەکی لە نەخوێندەوارانی ئەو مەڵبەندانە بوون بەخوێندەوار . . (١٨٨٥) قوتابخانەی میللی بۆیان کرایەوە تا لەسەر خوێندنیان بەردەوام بن‌و باوەرنامەی خوێندنی سەرەتایی تێدا وەرگرن . . . !

کار بەردەوامە ، ئەرکی بێ‌پایان بەردەوام . . شۆڕشیش رۆژ دوای رۆژ ، دەوری دیاریکراوی خوی لەم کۆرە هەرە گرینگەدا ئەبینێو تا ئەو رۆژەیش دوا نەخوێندەوار لەم وڵاتەدا نامینێو نەخوێندەواری بنەبڕ ئەکرێت واز لەم کارە شارستانیەی خۆی ناهێنێو دەستی لێ‌هەڵناگرێ . . !

## بنکەی زانستی کشتوکاڵ . .

لەگەڵ رەوتی پیرۆزی هەنگاوەکانی شۆرشی تەموزدا ژیان رۆژ دوای رۆژ رووی خوی بەرەنگێکی سەوز ئارایشت ئەدوا و موژدەی کودەتایەکی بنەرەتی کشتوکاڵی پی‌یە . .

لەم تەمەنە پیروزەشیدا ، شۆرش هەر تەنیا خۆی بەبەرهەمی نەوتەوە نەبەستاوە ، بەڵکو لەبەر روشنایی بنچینەیەکی زانساتانەدا . گەلێ چارەسەری بۆ مەسەلەی کشتوکاڵی نوێ هێنایە کایەوە . .

لەئاستی کۆمەڵەی هەرەوەزی جوتیاراندا ، ژمارەی ئەو کۆمەڵانە گەیشتۆتە (٣٥٥) ئەندام ، کە جاران تەنیا (٦٣) ئەندام بوو . .

کاری چاککردنی زەوی‌وزاری کشتوکاڵیش ، رۆژ بەرۆژ روو لەزیادبوونایە . . نەخشەی ساڵی (٨١-٨٥)دایناوە (٢٠٤٥) دۆنمە زەوی چاك بکاتەوە ، بۆ ئەمەیش نزیکەی (٢٥٢) تۆن لەپەینی کیمیاوی بە کەرتە جوێ‌جوێ‌کانی .

بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ دراوە . . ئەو دراوەی کە لەلایەن بانقی هەرەوەزی کشتوکاڵەوە بۆ جوتیاران تەرخانکراوە ، گەیشتۆتە (١٧ر٣) ملیۆن دینار . .

روپێوی ئەو زەویانەی کە لە ئافاتو نەخۆشیەکانی کشتوکاڵ پاكکراوەتەوە ، گەیشتۆتە (٣ر٧) ملیۆن دۆنەم .

لەدەرفەتی سامانی گیانلەبەرەکانیش‌دا ، عیراقی شۆرش پی‌ی ناوەتە بوارێکی زور فراوانەوە . . تەنیا بەرهەمی هێلکە گەیشتۆتە (١٠٠٠) ملیۆن هێلکەو گۆشتی مریشك گەیشتۆتە (٦١) هەزار تۆنو (١٨) پرۆژەیش بۆ پەروەوەردەکردنو قەڵەوکردنی مەرو ماڵات دامەزراوەو (١٨) فابریقەی ئالیکیشی لەپاڵ دایە و لەساڵێکا (٥٧١) تۆنە ئالیك وەبەرهەم‌ئەهێنێ . . !

## بـنـچـیـنـەیـەکی قـایم و . . . پـیـشـەسازی نیشتمانی . . . !

لەپاڵ ئەو هەموو کۆسپ‌و تەگەرانەی کە لەبواری کەرتی بەنرخی پیشەسازی‌دا رووبەرووی شۆرش بوەوە ، شۆرش لەسەر بەرنامە زانستیەکانی سوور بوو ، توانی گەلێ دەسکەوتی فراوانو بنەرەتیانە ، لەم بوارەدا بێنێتەکایە وهخ . . ئەوەبوو ، گشت کۆنە پرۆژەکانی ژیاندەوەو خستنیەکارو رێژەی بەرهەمی ئەم کەرتەی بەرزکردەوەو بەتەواوی هەموو هێزو توانای خۆی بۆ ئەم کارە هەرە گرینگ‌و بنجی‌یەی کاری گەشەکردنی ئابوری‌و کۆمەلایەتیا تەرخان کردو . .

بەمەیش گەشەپێکردنی پیشەسازی هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ تەمەنی شۆرشا کەوتە پێرەوکەو گەلێ شێوازی تەکنولۆژیی بۆ پەرەپێدانی بەرهەمی پیشەسازی نیشتمانی بەکارهێناو هەولێکی بێ‌شوماریشی‌دا بۆ لەیەك‌گرێدانی کشتسازی‌و پیشەسازی‌و هەروا گەشەکردنی جیاجیای ئابوری ، لەپێناوی بەدیهێنانی ئابوریەکی رێك‌و هاوسەنگ‌و تەواو لەسەر خاکی بەپیتی عیراقا . .

لەئاستی پلانی گەشەپێکردنی ساڵانی (٧٦ - ٨٠)دا ، شۆرش بایەخێکی زۆری بە زێدەبایی ئابوری داوە ، تا ئەم کەرتەو بەتایبەتی ئەو پیشەسازیانەی کە دەورێکی کاریگەر لە ئیستیسمارکردنی پلانەکانی بنیادنانا ئەبینێ‌و ئاتاجیەکانی گەشەکردنی کشتسازی جێ‌بەجێ‌ئەکاتو لەهەمان کاتیشا ، جولانەوەی پیشەسازییش پێخۆر ئەکات بەو کەرەستە سەرەتاییانەی کەلە کاری رۆژانە پێویستیەتی . .

لەچوارچێوەی ئەم پلانانەدا ، پیشەسازی‌ی نیشتمانی بەتەواوی گۆرراو بەرەوپێشەوە هەنگاوی‌نا . . جاران دراوی تەرخانکراوی پیشەسازی (٦ر١) ملیۆن دینار بوو ، کەچی لەم ساڵانەدا گەیشتە (٢ر٧٠) ملیۆن دینار . . گەر جاران دراوی بەشداری‌کردن تەنیا لە (١٠) کۆمپانیادا (½) ملیۆن دینار بوو ، کەچی ژمارەی ئەو کۆمپانیاکە بانقی پیشەسازی بەشداری تێداکرد (١٧) کۆمپانیا ، گەیشتۆتە (٣ر١٦) ملیۆن دینار . . بەمەیش بنکەیەکی زانستیانە ، بۆ پیشەسازیەکی فراوانی نیشتمانی لە عیراقی شۆرشا لەدروست‌بوون‌دایە . .

**ئەنجومەنی نیشتمانی . . .**

ژیانی دیموکراتیانە ، یەك لەو مەسەلە هەرە گرینگانە بوو ، بیوە ماخولیای شۆڕش‌و هەر لەسەرەتای بەرپابوونی‌یەوە ، کۆششی بۆ ئەکرد و هەوڵی بەجەرگانەی بۆ ئەدا . .

ئەوەبوو ، توانی رەوتی خەباتی بێووچانی خوی ، بە سەرهەڵدانی یەکەم ئەنجومەنی نیشتمانی ئارایشت بدات‌و ئەوەیش بۆ جیهان دووپات بکاتەوە کە : ئەم وڵاتە خەریکی بنیادنانی ژیانێکی نوێ‌و نموونەیەکی نوێیەو بەهیچ کلۆجێکیش دەست لەم ئەرکە مێژوویی‌و شارستانیەی خۆی هەڵناگرێت‌و ئەشیەوێ بیێ بە نموونەیەکی رابەر ، لەجیهانی سێیەماو بەرەو شارستانیەتێکی پێشکەوتوخواز هەنگاو هەڵگرێ . . !

* لەراستیدا ، تەجرەبەی سەرهەڵدانی ئەنجومەنی نیشتمانی‌و بۆ یەکەمجاریش لە مێژووی سیاسی عیراقا ، تەجرەبەیەکی دیموکراتیانە بوو ، کە جەماوەری گەل ، بەوپەری خوشی‌و سەربەستی‌یەوە ، روویان تێکردو نوێنەرانی خۆیان هەڵبژارد . . بەمەیش ئەوەیان سەلماند کە ئەم گەلە هوشیارە ، بەگیانێکی بەرزەوە لە باری مەسئولیەتی خۆی ئەگات‌و ئەرکی مێژوویی ئەگرێتە ئەستۆ . .

بێگومان ( ) حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٠ ، نیشانەیەکی گەورەیە لەژیانی سیاسی‌و دیموکراتی جەماوەری بەجەرگی عیراق‌و تا مێژوویش لەرەوتا بێ ، ئەم نیشانەیە ئەبێ بەسەرەتایەکی هەرە زیندووی عیراقیەکان لە پاشەرۆژێکی نزیك‌و رووناكدا . . !



# دەسکەوتە نەمرەکە

کە شۆڕشی نەمری (١٧)ی تەمووز بەرپابوو . لەیەکەم رۆژی‌یەوە روبەڕووی گەلێ گیروگرفتی گەورە گەورە بووەوە . لەسەرووی هەموویانەوەیش مەسەلەی رووبەروبوونی مۆنۆپۆلەکانی نەوت . . .

چەند ساڵێك بەسەر شۆڕش تێپەڕی ، بەتەواوی خوی شەتەك داو گەلی وریا کردەوەو هەموو لایەك‌و توانایەك ئامادەکراو لە (١) حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ دا . دەستی بەجاڕدانی خۆماڵیکردنی نەوت کرد . . هەموو دەستەو دایەرەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی لی‌ی وروژان . کەچی لەئەنجامی بەرگەگرتنی گەل‌و شۆڕشی سەرفراز ، گشت پیلان‌و ئابلوقەدانێك رەتکرایەوەو ئەم دەسکەوتە نەمرە ، بەتەواوی هاتە کۆڕی پراکتیك‌و سەری‌گرت . . بەمەیش شۆڕشی پیرۆز توانای بێپایانی خۆی لەرووبەروبوون‌و کاری بەرەنگاریا دووپاتکردەوە ، بەمەیش رەسەنایەتی خۆی بەسەرلەبەری دنیا سەلماندو بەتەواویش عەزیمەتی کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانی نەوتی بۆرداو نەوتی خاوی خۆی خستە نێو بازاری جیهانی‌یەوەو لەنێوان حەوت ساڵانا بەرهەمی نەوت لە (٧٥) ملیۆن تۆنەوە گەیشتە (١٧٥) تۆن . .

حاڵی حازر ، عیراق شۆڕش دەورێکی یەجگار دیار لەئاراستەکردنی سیاسەتی رێکخراوی (ئۆپیك)دا ئەگێڕێت‌و هەم بەرژەوەندی خۆی‌و هەم بەرژەوەندی وڵاتانی ئۆپیك ئەپارێزێت . . !



«ئەو تەجرەبە شۆڕشگێڕانەی کە : حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ، لەساڵی ١٩٦٨دا رابەرایەتی کرد وبنەماکانی پتەوتر کرد ، لەگەڵی بوارو شوێندا ئەوەی سەلماند کە : دەبێ سەرشارە فیکری و مەبدەئییەکان لەیەك گرێ بدرێن و بخرێنە مەیدانی پراکتیکەوە . . .»

سەرۆکی فەرماندە
صدام حسین

لەوەتەی رژێمی تارانی خۆپەرست ئاگری شەڕی سەپێنراوی بەرووماناهەڵگیرساند ، پارێزگای سلێمانیش شانبەشانی پارێزگاکانی تری وڵات سەبارەت بە پتەوکردنی بەرەکانی جەنگ‌و پاراستنی گیان‌و هەستی سەرکەوتنەکانی سوپای دلێرمان کە لەبەرەکانی جەنگ‌دا وە دەستیان هێناوە توانیویەتی ئەرکی سەرشانی خۆی رابپەڕێنێت . . نمونەی ئەمەشمان زیاتر لای یەکێتی‌و رێکخراوە میللی وپیشەیەکان بۆ روون‌دەبێتەوە . . ئەوەتا یەکێتی نەقابەکانی کرێکارانی پارێزگا لەمانگی ئازاری ئەمساڵ‌دا بەبەرهەڵست‌کردن‌و روونکردنەوەی چمکە مێژوویەکانی ئەم دوژمنایەتیەی دوژمنی رەگەزپەرست هەڵساوە . ئەمەش لە رێگای بەستن‌و سازکردنی چەندەها کۆری فراوانەوە کە زوربەی هەرەزۆری کرێکارانی مەڵبەندو قەزاو ناحیەکانی پارێزگای سلێمانی تیا ئامادەبوون‌و لەلایەن سەرۆك‌و ئەندامانی نەقابەوە بەدورودرێژی باسی هۆکانی هەڵگیرساندنی ئەم جەنگەیان

# چالاکی ی پارێزگای سلێمانی بۆ جەنگی قادسیەی صدام



بۆکراوەو دەوری چینی کرێکارانیان تیادا بەسەرکردوەتەوە . . هەروەها چەند چالاکی یەکی هونەری لەم بوارەدا پێشکەشی کردوە لەوانە سازکردنی پێشانگەیەکی پۆستەر لەهۆڵی یانەی وەرزشی کرێکاران کە تێکرا بەرهەمەکانی دوواتی رژێمی دارزاوی ئێرانی دەکردەوە . . . ئەمەو بەشداری بونیان لەچەند میهرەجانێکی رۆشنبیری تردا کە بۆ خزمەتی جەنگی قادسیەی صدام سازکرابوون .

سەرباری ئەمانەش بەبۆنەی جەژنەکانی ئازارو نەورۆزەوە نەقابەکان هەموو شەقامو گۆرەپانەکانو جێگا گشتی یەکانی شاری سلێمانیان رازاندۆتەوە تورانیویانە دوو کۆری فراوانی تر سازکەن بۆ کرێکارانی نەقابەکانی کشتوکاڵو شارەوانیو کارەبا کە بۆ روونکردنەوەی گرنگێتی جەنگی قادسیەی صدام و بەندەکانی یاسای ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان تەرخان کرابوون . . شایانی باسیشە لەئەنجامی تەنها ئەم دوو کۆڕەوە زیاتر لە (٢٠٠) کرێکاری بەشی شارەوانی هاتنە ریزی فیداکارانی جەنگی (قادسیەی صدام)ی پیرۆزەوە . . هەربەم بۆنەشەوە ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارەکانیان هاوبەشی ئاهەنگ گێرانی جەژنی نەورۆزی ئەمساڵیان کردو تیایدا چەندەها چالاکی هونەریان پێشکەش کرد . . ئەمانەو لەم رۆژانەشدا سازدانی زەنجیرەیەك کۆڕی تر بۆ زۆربەی کرێکارەکانی پارێزگای سلێمانی کە ئەمانەشی راستەوخۆ ناوەرۆكو مەبەستیان دەست نیشانو دوواتی دوژمنایەتی فارسە رەگەزپەرستەکان دەکاتەوە بەرامبەر گەلو نیشتمانی عێراق .

لەلایەکی ترەوە یەکێتی هەرەوەزی جوتیارانی پارێزگاکەمان لەم کاروانە پیرۆزەدا چالاکی خۆی پیشانداوە ئەمەش بەزیاتر بلاوکردنەوەی رۆشنبیری لەناو چینی جوتیاراندا لەرێگای سازکردنی ژمارەیەك لەکۆری فراوان وەك سازکردنی پێنج کۆر لەقەزای قەلادزیو سێ کۆر لەشاربازێرو (١٦) کۆر لەچەمچەمالو (٥) کۆر لەرانیەو چواریش لە دەربەندیخانو ژمارەیەکی تر لەقەزای هەلەبجەکە بەو چەشنە ژمارەی کۆرەکانیان لەمانگی ئازاری ئەمسالدا دەگاتە زیاتر لە (٣٠) کۆری فراوان کە ئەمانەش بێگومان بەشێوەیەکی سەرەکی باسی جەنگی رەوای ولاتمانی تیاکراوە لەگەل هاندانی چینی جوتیاران بۆ هەلگرتنی چەكو بەشداری بونیان لەریزی فیداکارانی ئەم جەنگە کە شایانیباسە لەیەکەم لیستەیاندا ژمارەی فیداکارانیان لەدوو هەزارو پێنج سەد (٢ر٥٠٠) جوتیار تێپەریبوو . . سەرباری ئەمانەش هەر لەنێوان ئەم کۆرانەدا دەربارەی یاسای نەهێشتنی نەخوێندەواریو جێبەجێ کردنی بەندەکانی نەخشەی کشتوکالو ئاژەلداری قسەکراوە هەروەها بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە زیاتر لە (٤٠٠) چوارسەد جوتیار بانگ کرابوون بۆ هاوبەشی کردنیان لەئاهەنگی بیرەوەری ناوبراودا .

هەروەها بەریوەبەرێتی رۆشنبیری جەماوەر لەهەمان مانگی ناوبراودا بەپێشکەش کردنی چەندەها چالاکی هەمەرەنگ هەلساوە لەوانەش بەردەوامبوونی بەشی راگەیاندن لەبەریوەبەرێتی ناوبراو لەدابەش کردنی ژمارەیەکی زۆر لەناملیکەی سیاسیو وێنەو پۆستەرو پیشاندانی فلیمو تۆمارکردنو دابەش کردنی چەند شریتێکی کاسێت بەسرودی نیشتمانیو گۆرانیو فۆلکلۆری کوردی بەسەر زوربەی دائیرەکانو رێکخراوو یەکێتیەکانی تردا . هەروەها بەبۆنەی نۆزدەهەمین بیرەوەری شۆرشی هەشتی شوباتەوە تیپی شانۆی سەربەم بەریوەبەرێتیە هەلسا بەپێشکەش کردنی شانۆگەری ئاسك کە ئەمەش لەدانانی کاك شیرکۆبێکەسو دەرهێنانی هونەرمەند کریم عثمان بوو . . هەر لەم روەشەوە لەشاری هەلەبجە کۆرێکی فراوانی بۆکورتە چیرۆك سازکرد کە تیایدا برادەران عبد الکریم حسنو حکیم صالحو عبدالله دەروێش بەرهەمی خۆیان خوێندبووەوە . . ئەمەش جگە لەسازکردنی ئاهەنگێکی گۆرانی هەرلەوێ کە هونەرمەندان هوشیار محمد فرجو بەختیار مەریوانیو محمد توفیق هاوبەشیان



تیاکردبوو . . هەروەها ئەم بەریوەبەرێتیە هەلساوە بەسازکردنی پێشانگەیەکی وێنەی فۆتۆگراف لەهۆلی مۆزەخانەی سلێمانی کە زوربەی خاوەن ستۆدیۆکان هاوبەشیان تیاکردبوو . . ئەمەو بەبۆنەی بیرەوەری بەیاننامە مێژوویەکەی (١١) ئازارەوە بەریوەبەرێتی ناوبراو هەلسا بەسازکردنی پێشانگەیەکی تایبەتی هونەری تەشکیلی بۆ هونەرمەند برهان علی صالح کە لەلایەن بەرێز جعفر عبد الکریم بەرزنجی پارێزگاری سلێمانیەوە کرایەوەو هاورێ لێپرسراوی حزب ئامادەیبوو ناوبراوانیش خەلاتی تایبەتی ئەم هونەرمەندەیان کرد کە بەرهەمەکانی بەشێکیان تەرخانکرابوو بۆ پیشاندانی رژێمی دارزاوی ناو ئێرانو پیشاندانی سەرکەوتنەکانی سوپای دلێرمان لەبەرەکانی جەنگی (قادسیەی صدام) دا .

هەروەها یەکێتی قوتابیانی کوردستانی عێراق لقی سلێمانی لەنێوان ئەم مانگەدا بەرێکخستنی چەند سەردانێك هەلساوە بۆ بەرەکانی جەنگ لەوانەشی سەردانی قوتابیانی خانەی پێگەیاندنی مامۆستایانی کچان بۆ ناوچەی نەوسودو پێنجوین . . . ئەمەو سازکردنی چەند کۆرێکی فراوان لەوانەشی کۆرێك لەخانەی پێگەیاندنی مامۆستایانی کوران بە ئامادەبوونی هاورێ ئەمینداری نهێنی نوسینگەی قوتابیان کە تیایدا دەربارەی زۆر چمکی جەنگی قادسیەی صدام قسەکراوەو دەورو هەلوێستی قوتابیانیشی لەنێوان کۆرەکەوە سەبارەت بەم جەنگە پیرۆزەی ولات دەستنیشانو دوویات کردوەتەوە . . هەرلەم روەشەوە



چەند کۆبونەوەیەکی تریان بەسەرۆکی لیژنەکانی قوتابیان کردوە کە دیسانەوە ئەمانەش ناوەرۆکیان بە جەنگی رەوای ولاتمانەوە پەیوەندی‌یەکی راستەوخۆی هەبووە . . هەروەها سازکردنی ژمارەیەکی زۆر لەکۆری هاومەبەستی تر بۆ هەموو قوتابیانی قوتابخانەکانی پاریزگای سلێمانی . . ئەمانەش سەرباری جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانی یەکێتی لەهەموو جەژن‌و بیرەوەری‌یەکان‌دا بەرازاندنەوەو جوان‌کردنی شەقام‌و بارەگای یەکێتی خۆیان بەوێنەی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین‌و هەلواسینی لافیتەو دروشمی سەر بە بیرەوەری‌یەکان . . هەروەها سازکردنی چەند ئاهەنگێکی هونەری بەبۆنەی جەژنەکانی ئازارو نەورۆزەوە لەگەڵ سەردانی بەردەوامیان بۆ ناو قوتابخانەکان بۆ زیاتر هان‌دانی خوێندن‌و بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندەواری بەتایبەتی لەدۆخی ئێستای ولاتەکەمان‌دا کە بەجەنگی (قادسیەی صدام)ی پیرۆزدا تێ‌دەپەرێ .

لەلایەکی تریشەوە یەکێتی ئافرەتانی عێراق لقی سلێمانی شان‌بەشانی یەکێتیەکانی تر لەبواری جەنگی (قادسیەی صدام) دا بەردەوام دەوری خۆی سەلماندوە . . لەوانەشی کەتەنها لەمانگی ناوبراودا جێبەجێی کردوە رێکخستنی چەند سەردانێك بوە بۆ بەرەکانی جەنگ لەناوچەی نەوسودو پێنجوێن‌دا . . هەروەها سەردانی خێزانەکانی شەهیدان‌و برینداران بۆ ماڵەوەو خەستەخانەو پێشکەش کردنی دیاری تایبەتی خۆیان . . ئەمانەش سەرباری کۆبونەوەیەکی گەورەی ئافرەتان لەبەردەرکی سەرادا کە تیایدا بەرێز پارێزگاری سلێمانی‌و هاورێ لێپرسراو ئەندامانی حزب ئامادەبوون‌و بەو بۆنەوە چەند وتارێك پێشکەش‌کراو تیایدا دوپاتی وەدەست‌هێنانی مافە رەواکانی ولاتمان کرایەوەو هەروەها دەوری ئافرەتانیش لەم جەنگە پیرۆزەدا سەرلەنوێ دوپات‌کرایەوە . . ئەمەو دابەش‌کردنی چەندەها پۆستەرو نامیلکەی سیاسی بەسەر هەموو دام‌ودەزگاکانی پارێزگادا . . هەروەها سازکردنی پێشانگەیەکی وێنەی فوتۆگرافی لەهۆڵی قوتابخانەی گوێژەی کچان‌و کردنەوەی لەلایەن بەرێز پارێزگاری سلێمانی‌یەوە کەوێنەکانی لەلایەن وێنەگرە ئافرەتەکانی یەکێتی‌یەوە لەبەرەکانی جەنگ‌دا ئامادەکرابوون . . ئەمانەو سەردانی بەردەوامی خۆیان بۆ مەڵبەندەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواری‌و قوتابخانە گەلی‌یەکان‌و سازکردنی چەندەها کۆر بەناونیشانی (گیانی فیداکاری گیانی لەخۆبوردن‌و سەرکەوتنە) .

دواجار هەر لەروانگەی جەنگی (قادسیەی صدام)ی پیرۆزەوە یەکێتی گشتی لاوانی عێراق لقی سلێمانی چەند چالاکی‌یەکی تایبەتی خۆیانی پێشکەش‌کردوە لەوانەش سازکردنی زەنجیرە کۆرێك دەربارەی روونکردنەوەی دەست‌درێژی‌یەکانی رژێمی تاران بۆ خاکی ولاتمان لەهەموو قوتابخانە ناوەندی‌یەکانی کوران‌و کچان‌دا لەگەڵ چەند کۆرێکی هاومەبەستی تردا بۆ لیژنە ناوخۆیەکانی پێشرەوان‌و نەوجەوانان هەروەها سەردانی بەردەوامی خۆیان بۆ ناو خێزانی شەهیدان‌و لای بریندارەکانی خەستەخانەو پێشکەش‌کردنی دیاری بۆیان . . ئەمانەو کەڵك وەرگرتن لەکۆبونەوە هەفتانەکانی پێشرەوان‌و نەوجەوانان بۆ رێنمایی‌کردنیان بەپێی فەرمایشتەکانی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین . هەرلەم روەشەوە سازکردنی میهرەجانێکی شیعرو خوتبە خوێندنەوە کە تایبەتی‌بوون بە جەنگی ئێستای ولاتەکەمانەوە جەنگی قادسیەی‌صدام دژ بەفارسی داگیرکەر ئەمانەش سەرباری ئامادەکردنی هەزارو بیست‌و نۆ کاردێری جەنگاوەر بۆ هاوبەشی‌کردنیان لەبەرەکانی جەنگ‌دا . . جگە لەوەش ژمارەیەکی تریان هاوبەشیان لەبەرەکانی جەنگی پێنجوین‌و نەوسودا کردوە .

ئامادە کردنی
فریا عبد الله
نوسینگەی سلێمانی

لە یادی بیست‌و چوار ساڵەی بەرپابوونی
شۆڕشی ١٤ی تەمووزی پیرۆزدا :

# سەرکەوتنێکی مێژوویی‌و لاپەڕەییکی پرشنگدار لە لاپەڕەکانی خەباتی نیشتمانی‌و نەتەوەیی دا

لە چواردەی ئەم تەمووزەدا ، جەماوەری گەلەکەمان ، یادی بیست‌و چوار ساڵەی سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی نیشتمانی‌و نەتەوەیی رزگاریخوازی کردەوە . . ئەو سەرکەوتنە مێژوویی‌یە پیرۆزەی کە گەلی مەزنمان دژی ئیستعمارو کۆنەپەرستانی بەدی‌هێنا .

لە چواردەی تەمووزی ١٩٥٨دا ، واتە بیست‌و چوار ساڵ پێش ئەمڕۆ ، جەماوەری تێکۆشەری عیراق ، تەخت‌و تاجی رژێمی تاوانبارو سەخت‌و خوێن‌ڕێژی تێکشکاندو ، بانگی رزگارکردنی عیراق لەژێر چنگی کۆنەپەرست‌و ئیستعمارو ئەو پەیمانانەی کە وای لەگەلەکەمان کردبوو نەتوانێ هیواو خواستە نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌یەکانی بەدی‌بهێنێ ، راهێشت .

شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ ، دەستکەوتنێکی سروشتی‌و بەروبوومێکی رەوای خەبات‌و تێکۆشان بێ‌ووچانی سەخت‌و دووردرێژی جەماوەری ئازامان بوو دژی هێزی ئیستعمارو کۆنەپەرستان ، کە نزیکەی چل ساڵ بەردەوام بوو و ، تیایدا خوێنی پاکی خۆی کردە قۆچی قوربانی خاک‌و نیشتمان .

شۆڕشی چواردەی تەمووز ، شۆڕشێکی نیشتمانی رزگاریخوازیی ئامانج‌و رێڕەو دیاربوو . . لە پوختەو ناوەرۆکیشیدا ، شۆڕشێکی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز بوو کە ئاشکرا سوربوونی جەماوەری ، بۆ رزگاربوون‌و ئازادبوون لەژێر دەستی ئیستعمارو ، بنیات‌نانی بنکەی ئابورێکی سەربەخۆو دوور لە نیازو ویستی بۆگەنی بێگانە ، دەردەبڕی . .

سەرکەوتنێکی نەتەوەیی گرینگی بۆ خەباتی عەرەبی کە لە قۆناغی پەنجاکاندا لە پەرەسەندن دا بوو ، رەچاوکرد .

بەم‌جۆرە ، شۆڕش ، رژێمێکی کۆماریی داناو ، عیراقی لە پەیمانی ئیستعماریی بەغدا رزگار کردو کۆتایی بە گشت دیاردەی هێزو دەسەلات‌و دەستێوەردانی بێگانە لە کاروباری ناوخۆی عیراقدا ، هێنا .

شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ ، کە قوناغێکی گرینگ بوو لە خەباتی نیشتمانی‌و نەتەوەیی ، لە توانایدا هەبوو زۆربەی ئامانج‌و نیازو خواستی گەل جێ‌بەجێ بکات گەر بهاتایە لەسەر ئەو رێڕەوە بڕۆیشتایە کە بۆی دانرابوو . . بەڵام پەیڕەوی



دکتاتۆری تاکەکەسی ڕێبازی شۆڕشی بۆ بەرژەوەندی تاکەکەسی گۆڕیو . . سەرەنجام بووە هۆی ئەوەی شۆڕش یەکی بکەوێت‌و نەتوانێ هیواو خواستەکانی ئەوگەلەی کە شۆڕشی دروستکرد ، بەدی بهێنێت .

سەرەرای گشت دیاردەی خۆسەپاندن‌و لادانی رژێمی دکتاتۆری تاکەکەسی‌و ، کارو شێوازی گرتن‌و کوشتن‌و لەناوبردن کە تاقی شعوبیەت پی‌ی هەڵدەستا ، جەماوەری تێکۆشەر ، بە ڕابەرایەتی حیزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەب ، وازی لە خەبات‌و ڕێبازە نەتەوەییەکەی نەهێناو ، بە باوەرێکی پتەوو قووڵتر خەباتێکی بێ‌وێنە ، بەرەنگاری ڕێرەوی دیکتاتۆری‌و هەڵسوکەوتی تاقی لادەران بووەوە .

سەرەنجام ، ئەو هەوڵ‌و خەباتە ، لە بەرەبەیانی هەشتی شوباتی ١٩٦٣دا ، ئالأی سەرکەوتنی شۆڕشی ڕەمەزانی بەرزکردەوە .

دیسان ، هێزی کۆنەپەرست‌و گومانلێکراو ، وازیان لە پیلاندانان‌و وەستان دژی جەماوەرو پارت‌و شۆڕشە نەتەوەیی‌یە میللی‌یەکەی نەهێنا . . توانیان گری «بووکی شۆڕشەکان» ، کە هێشتا هەر لە مانگی دەیەمینی‌دا بوو ، لە هەژدەی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ دا کپ بکەنەوە . . وە دەستیان بەلەناوبردنی سەرکردەکانی شۆڕش‌و ئەندامانی پارت کرد ، بەلأم ، ئەو گرو کڵپەو خەباتەی لە دڵ‌و دەروونی تێکۆشەران پنگی خواردبووەوە ، چۆن کپ دەکرێتەوە ؟ ؟
بێگومان ، قەت کپ نابێتەوە !

کپ نابێتەوە بەڵکو زیاتر بۆ خەبات‌و تێکۆشانی بێ‌وێنە پاڵیان دەدات .

خەباتگێرانی حزب ، کە گیانی پاکی خۆیان بۆ سەربەرزی‌و ئازادبوونی خاك‌و نیشتمان دەکەنە قۆچی قوربانی ، هەر ئەبێ سەربکەون‌و بەرووبوومی خەبات بدرونەوە .

بەجۆرە ، توانیان شۆڕشی ١٧ - ٣٠ی تەمووز بهێننە کایەوە . . وە بۆ ئیستعمارو کۆنەپەرست‌و دوژمنانیان دوپات کردەوە کەوا ئیرادەی خەباتگێرو تێکۆشەرو حەقخوازان لە هەموو پیلان‌و ویستە بۆگەنەکانیان بەهێزترە .

گەلی عیراق ، کە گۆرەپانی بەرەکانی جەنگی بۆ رەگەزپەرستانی چاوەچنۆك . . رژێمی مەلا خومەینی‌و دەستوپێوەندی کردووەتە قەبرستان‌و ، هەمیشە ئالأی سەرکەوتن بەرز دەکاتەوەو داستانی پاڵەوانێتی لە مێژووی نوێ‌ی جەنگدا تۆمار دەکات ، لەو کاتەی کە یادی ئەم شۆڕشە پیرۆزە دەکاتەوە ، زیاتر ئیمانی پتەوترو ئیرادەی بەهێزتر دەبێت .

توانای عیراقییەکانیش ، چونکە لە خاکی نیشتمان‌و دڵ‌و دەروونی جەماوەر هەڵدەقوڵێ ، قەت بنی نایەت‌و بێ‌هێز نابێت .

- سەربەرزی‌و سەرکەوتن بۆ پاڵەوانانی سەدەی بیستەم‌و سەرکردەی تێکۆشەر (صدام حسین) .

هەزاران سلاو بۆ شەهیدانی خاك‌و نیشتمان .

- مردن‌و ڕوورەشیش بۆ دوژمنانی حەق‌و مرۆڤایەتی .

«ڕۆشنبیری نوێ»





# "لێکۆڵینەوەی ڕامیاری"

أ - ن - دڵسۆز

میژوو بۆمان ڕوون دەکاتەوە ، هەر کاتێك گەلێك لە گەلانی جیهان کەوتبێتە ژێر دەسەڵاتێکی زۆرەکی ، یان دوچاری دەسەڵاتێکی ستەمکارو ناڵەبار بووبێت‌و بە نەبوونی‌و هەژاری‌و نەخۆشییەکانی تری گەلان دوچار بووبێت ئەم نالەباری‌یانە خۆیان بوونەتە هۆی پاڵ‌پێوەنانی گەل بۆ ڕاپەڕین دژی ئەو ڕژێمە سا یان وەك کاوەی ئاسنگەر ، قارەمانێك ڕاپەڕیوەو خەڵکیش شوێنی کەوتوون یان وەك شۆڕشی فەرانسە کە کۆمەڵ کۆمەڵ چینەکان‌و پارتەکان یەکیان‌گرتووەو ، یان بڕی‌جار هێزی سوپا بەدادی‌خەڵکەوە هاتووە وەك شۆڕشی میصرو ڕاپەڕینە سوپاییەکانی تری سەدەی بیستەم کە شۆڕشی چواردەی تەمووزی عیراقیش یەکێ‌بوو لەو جۆرە ڕاپەڕینانە ، واتە سوپا دەردی خەڵکی هەست‌کردووەو بەدادیانەوە هاتووەو ، فریایان کەوتووە بەڵام ئاشکرایە کە ڕاپەڕین تەنها بۆ ئەوە نییە ڕژێمەکە لاببات‌و هیچی‌تر بەڵکو بۆ ئەوەشە کە پاش لابردنی ڕژێمە نالەبارەکە خراپ چاك‌کات‌و نالەبار بینێتەبارو خوار ڕاست‌کاتەوەو چارەی گرفتارییەکانی ئەو گەلە بکات واتە ئەبێ ڕاپەڕین بۆهاوردنەدی

ئاوات‌و داخوازەکانی گەل بێت ، ئەبێ بۆ پێش‌خستن بێ ، ئەبێ بۆ گۆڕین بێت . لەدوا کەوتن‌و نالەبارییەوە بۆ پێش‌کەوتن‌و ڕێکوپێک‌کردنی ژیان . جا پاش ئەم پێشەکییە ئەبێ بۆمان دەرکەوتێ کە گەلی ئێران بۆچی ئەیەویست بە شۆڕش هەڵسێت ؟ لە دژی چی ڕاپەڕیبوو ؟ چی ئەویست ؟ ئاواتی کام‌بوو ؟ ئەو شتانەی کە نەی‌بوو کامەبوو ، ئەوەی ئەیەویست بەدەستی بێرێت‌و پێ‌ی بگات کامەتا ؟

هەموو ئەزانین کە ڕژێمی ئێران ڕژێمێکی پادشایی‌بوو ، بە پێی یاسای (ئەساسی) ئەوان ئەبوایێ وڵات بە شێوەیێکی دیموکراسی ببرایێت بەڕێوە ، واتە ئازادی هەڵبژاردن ، ئازادیی پێنووس ، ئازادیی‌گوتن . هەموو ئازادی‌و سەربەخۆیێک کە لە ڕژێمی دیموکراسی‌دا پێش‌بینی ئەکرێت . بەڵام ئەوەبوو کە دیمان ، ئەم جۆرە ئازادی‌یە هەر ناوی بێ‌ناوکە بوو ، وڵات بەشێوەیێکی دیکتاتۆری‌و زۆرەکی‌و تەک‌ڕەوی (فەردی) بەڕێوە ئەبرا کەس مافی ئەوەی نەبو کە دەم بکاتەوەو دەردی دڵی خۆی دەربڕێ یان باسی کەموکوری گەل‌و وڵات بکات مەگەر لەو چوارچێوەیەدا کە دەوڵەت خۆی دیاری ئەکرد وە بەوچەشنەی کە خۆیان ئەیان‌ویست وەلەم دواییەدا پارتێکی میری بەناوی ڕەستاخێز دانرا بووە تەنهاحیزبی ئێران ، خزم‌و کەسوکاری شاو شاژن‌و پیاوە گەورەکان‌و کەسوکاریان دەسیان‌خستبووە ناو هەموو دەرامەتەکانی وڵات وە هیچ کۆمپانیاییێک نەبوو ، هیچ قۆنتراتێک نەئەکرا کە یەکێ لەمانە خۆیانی تێ هەڵ‌نەقولێنن وە تیایا بەشدار نەبن . هیچ نەتەوەو گەلێک خاوەنی هیچ‌جۆرە مافێک نەبوو . بەکورتی بڵێین دەردی‌گەلی ئێران یەک‌و دوان نەبوو وە ناوسکی ئەم گەلە وەکو هێلانە زەردەواڵە کون‌کون‌بوو ، نرخی هەموو شتێک بە جۆرێکی سەرسوڕهێنەر بەرز ئەبوویەوە . لەم حاڵوئەحواڵەدا بوو کە ڕۆشن‌بیران‌و مرۆڤە داوێن پاکەکان‌و کۆمەڵە سیاسییەکان بەتایبەت چینی خوێندکارو لاوچاکیان لێ‌کردبەلاداو قۆڵیان لێ‌هەڵماڵی بۆئەوەی کە پاڵێ‌بنێن بەو ڕژێمە ستەمکارەو ڕژێمێکی ڕێکوپێکی دیموکراسی بێرنە سەرکار ، گەل هاتبووە سەرئەوەی کە ئیتر نەڕواتە ژێرباری زۆرو سەر بۆ شاو لایەنگرانی شۆڕنەکات ئەم ملەجێرەو سەربادانە تەقریبەن لەساڵی حەفتاوپێنجەوە کەم‌کەم زۆری‌سەند ، بەڵام لێرەدا ئەبێ بڵێین ، لەگەڵ ئەم هەموو کەموکورییانەدا بەتایبەت «فشاری ڕامیاری» کە بریتی‌بوو لە بەرگری کردن لەهەموو جۆرە تێکۆشانێکی پێک‌هێنانی حیزب‌و نووسینی هەر شتێک کە بۆنی ڕامیاری بدات ، بەکورتی لەگەڵ ئەوەشا کە دەستی هەموو کەسێ شەتەک درابوو پێنووسەکان شکێنرابون‌و چھوو گوێی گەل دابەسرابوو میری خۆی دەستی دابوویە ڕێکوپێک کردنی زۆرشت وەک کردنەوەی ڕێگای تازەو زۆر گەورە دروس‌کردنی کارخانەی تواندنەوەی ئاسن‌و کردنەوەی قوتابخانەو زانستگەی زۆر دروس‌کردنی کارخانەی ئوتومبیل‌و تراکتۆرو ئەو جۆرە شتانە بەتایبەت پرۆژەی زۆر گەورەی کشتوکاڵ‌و بەربەندو ئاوو کارەباو بەربەرەکانی‌کردن لەگەڵ نەخوێنەواری‌و نەخۆشی‌و ئەوجۆرە شتانەدا ، وە شا خۆی یاسایێکی تازەی بۆ بەر بەرەکانێ لەگەڵ ڕەوشی ئاغاو جوتیاریدا ، دانابو هەرچەن ئەم‌کارەی شا شتێکی دادگەرانەو زانیاری‌یانە نەبوو واتە شتێک نەبوو چارەی گیروگرفتەکانی یاسای کۆنی کشتوکاڵ بکات بەڵام لەم ڕێگایەوە تێ‌ئەکۆشا کە پەیوەندی نێوانی خاوەن زەوی‌و جوتیار بپچڕێنێ تاوەکو ئیتر خاوەن موڵکەکان نەتوانن ئاغایی بکەن‌و هەریەکەی میری ناوچەیێک‌بێ . تا ڕادەیێکی زۆر شا بە ئاواتی خۆی گەیشتبوو . جا شا کە ئەم خزمەتانەی لە مەیدانی ئابوریدا ئەکرد ئەیەویست خۆی چۆنی بەباش ئەزانێ وابکا ، هەروەکو لەمەیدانی ڕامیاریدا ماوەی نەئەدا کەس خۆی تێکەڵێنێ ، لەمەیدانی ئابوریشا ئەیەویست هەرچۆنێکی لام‌چاکە هەروابێت . دیارە هەروەکو لەپێشا ووتمان گەل تینوی ئازادی‌بوو ، تینوی سەربەخۆیی بوو ، ئەیەویست لەژێر ڕکێفی بێگانەدا نەبێت ، ئەیەویست خۆی سەرۆک‌و سەروەری خۆی بێت ، بۆ هەموو کەسێکیش ڕوون‌بوو کە شا ناتوانێ لە کاروباری ڕامیاریدا بەبێ ئەمریکا پەنجە بکا بەئاوا ، جا لەئاوا کاتێکابوو کە وردە وردە گەل کەوتەخۆی‌و دەستی‌بە دەس‌وەشاندن کردو ، هەر جارێ لە شوێنێکەوە ئازاری میری ئەدا بەتایبەت لەزانستگەکانا .

لەهەمووی گرنگ‌تر کۆلێژی ئەندازیاری تاران ، ئیتر لەوەدا نەما کە ناوی‌بنرێت نهێنی . میریش کەم‌کەم کەوتە خەڵک‌گرتن‌و ئازاردان وەئەم تێکۆشەرانەی ناونا مارکسێتی‌ئیسلامی کەئەبنە ئەم دەستەی موجاهیدینەی ئێستە بەکورتی ئاگری شۆڕش تا ئەهات پتر بڵێسەی ئەسەندولەولاشەوە وشاری نیظامی تا ئەهات زیاتر ئەبوو تا ساڵی حەفتاوحەوت ئیترکارلەکار ترازاو تازە وای لێ‌هات کەهیچ‌کام ڕێگای گەڕانەوەو پەشیمانی‌یان بۆنەمایەوە ئیتر ئەبوایە یان گەل‌و چینی ڕوناک‌بیران‌و تێکۆشەران تیابچونایە یان ڕژێمی شا . جا کەوای‌لێ‌هات هەردولا کەوتنە دەس‌وەشاندن‌و



زۆر بە خراپی لێکیاندا . کوشتو کوشتار هەموو ئێرانی گرتەوە تاگەیشتە رۆژی هەشتی ئەیلولی ١٩٧٨ کەناوینرا رۆژی جمعەیڕەش کەپتر لە پێنج‌سەد خۆپیشاندەر لەتارانا کوژران . ئەبێ بڵێین کە یەکەم پەلاماری گەل زۆر لەوەپێشتر لە تەبرێزا ڕوویدا ئەویش زۆربەیان لە لاینگرانی ئایت‌الله شریعەتمەداری بوون لەو سەردەمەدا کەس ناوی خومەینی نەئەزانی مەگەر بەدەگمەن نەبووایە . بەڵکو ناو هەرناوی شەریعەتمەداریبوو بەتایبەت ناو بازاڕی تاران بووبوو یەك‌پارچە شۆڕش چونکی ڕەگی‌ئابوری ئێران وابەدەستی تورکەکانەوە کە لە سەدا نەوەدیان لاینگری شەریعەتمەدارین هەروەها ئاگر تیٚ‌بەربونی سینەما ریکسی ئابادانیش کە چوارسەد کەسی تیاسووتاو تائێستەش بەباشی ڕوون نەبووەتەوە چۆن وەبۆچ سووتا ؟ ئەم‌کارەساتەش لەئابی ١٩٧٩دا روویداو بەجارێك ئێرانی کردە پارچەیێك ئاگر . جا لەم‌کاتەدابوو کە لایەنگرانی شۆڕش لەدەرەوەی ئێرانا کەوتنە خۆیان . و لەئێرانیش شەریعەتمەداری زۆرپی بۆمیری هێنا کەهەموو دیلە ڕامیاریەکان بەرەلاٚبکاتو هەموو دەرکراوەکانیش لەدەرەوەی وڵات بگەڕێنەوە . بەم جەشنە خومەینی لەعیراقەوە چو بۆپاریس بۆئەوە لەو خەڵکە نزیك بێتەوە جائەوکاتە ناوی‌خومەینی کەوتە ناو ناوانەوە . بەتایبەت خومەینیو ئەوانەی بەدەوربەریابوون چونکی لەدەرەوەبوونو مەترسێکیان‌نەبوو ئەوان باشتر ئەیان‌توانی لەدژی شا بڵێنو بنوسن هەر لەم‌سەردەمەدا بوو کەبەختیار بووبە سەرەك‌وەزیرو شای ڕازی‌کردکەبڕوات . وە دەستی بە بەرەلاٚ کردنی دیلەکانو جیٚ‌بەجی‌کردنی داخوازیەکانیان کردە . پاش ماوەیێکی‌کەم خومەینیش هاتەوە سەر حازریو ، ئەوەی کوژرابوو کوژرابوو ، شایش پشتی‌شکابوو شۆڕش سەرکەوتبوو ئیترکاریٚ‌نەمابوو تابکرێت . جالێرەدا تەمەنی ڕاستەقینەی‌خومەینی دەستی‌پی‌کرد لێرە ئەبێ بپرسین : گەلی ئێران بۆچی شۆڕشی کرد ؟ چی ئەویست خۆی چی‌بوو ؟ ئەیەویست بیٚ بەچی ؟ . . . . وە ئێستە لەم‌داخوازو ئاواتانەی خۆی بەکویٚ گەیشتووەو چی دەس‌کەوتووە ؟ .

بەشێوەیێکی تێکڕا سەربەخۆیی ڕاستەقینە گەورەترین ئاواتی گەلی ئێران بوو هەموو وێڵ‌بوون بەشوێنی ڕژێمێکی دیموکراتی ڕاستەقینە ، دیارە کەمایەتیەکانیش وەکو کورد بلوج عەرەب تورکی‌ئاذەربایجانی وەتورکمەنەکان هەموویان ئۆتونومی‌یان ئەویست لێرەدا بگرە بپرسن جا ئەی‌بۆناوی فارسەکان نابەن ئەی مەگەر فارسەکان خۆیان کرۆکی ئێران نین ؟ لە وەڵاٚما ئەبێ بڵێین ڕاستەکەی ئەوەیە کەئەوان لەوەو پێش بەهەمومافێکی خۆیان گەیشتبون وەئەومافانەی کەخورابوونو پیٚ‌شێل‌کرابوون فارسەکان پیٚ‌شێلیان کردبوو واتە هەمووشتێك هە رهی فارس بوو لە کاتێکا فارسەکان سیٚ‌یەکێکی گەلی ئێران نابن کەچی وا پیشان ئەدرا کە هەمووی ئێران فارسن وە ئەبێ فارسەکان بە



خێری خۆیان بڕێ ماف بەشی ئەوانی‌تر بدەن بەڵێ کە لەم ڕوانگەیەوە سەیردەکەین تێ‌ئەگەین بۆچی شۆڕش سەراسەری ئێرانی گرتەوەو چۆن بوو کە هەمووی ئێران گڵپەی‌سەند واتە ئەم شۆڕشە دولایەنی گەورەی هەبوو یەکێ ، مافی نەتەوەیی کەمایەتیەکان دوهەم . دیموکراسی بۆ گەلی ئێران هەریەکێ لەم دوو مافە ئەبوایە چەندین داخوازی تریان دابین کردبایە کە بەتێکڕایی ئەبوونەهۆی پێش‌خستنی گەلانی ئێران بۆ ژیانێکی پڕلەکامەرانی ، جا ئێستە شی‌ئەکەینەوە تابزانین ئەم‌گەلانە تاچڕادەیێك بەم‌ئاواتانە گەیشتوون ، تاکوێ پێش‌کەوتوون . ئەمڕۆ نزیکەی چوارساڵ بەسەر ئەو گەرمەی خۆپیشاندان‌و تێکۆشان‌و شۆڕشەدا تێ‌ئەپەڕێت‌و زیاتر لەسێ ساڵیشە کە ئەم شۆڕشە پی‌گەیشتووەو هاتووەتە بەر بەڵام چ بەرێك‌و چ سەمەرێك ئێستە بەرهەمی ئەم‌هەموو ڕەنجە . ئەم هەموو خوێنە ئەم هەموو تێکۆشانە میوەیێکی زۆرتاڵە ژاری‌مارە چقڵە تاریکی‌یە گۆمی خوێنە زیندانە پەتە قەنارەیە دەس‌درێژی پاسداری ئێرانیە بەدەس‌ڕێژی گوللە بۆسەرسنگی ڕۆڵەی ئێران پاشە کشێ‌و بۆ پاش‌گەڕانەوەیە دەسەڵاتی زۆرەکی‌یە دیکتاتۆری‌یە گەل‌دەستی بڕاوەو بێ‌دەسەڵاتە هیچ‌کام لەپارتەکان هیچ‌کەس لەروو ناکیران هیچ‌کام لە نەتەوەکان بەهیچ‌ئاواتێ نەگەیشتوونەو هیچیان دەس‌نەکەوتووەو نەبوونە خاوەنی هیچ مافێك . با من لێرەدا دەردی دەرونی گەلی‌ئێران‌و دەردی‌دەرونی دادگەڕیی‌و دیموکراسی کزەی دەرونی ڕوناك‌بیران‌و هەناسەی ساردی دایك‌وباوکان‌و دوکەڵی سینەی زانستگەو کۆلێژەکانتان بۆ هەڵڕێژم . هەر وەکو ووتمان شۆڕش شۆڕشی گەلێکی چەوساو بوو کە کوڕانە بۆ بەدەس‌هێنانی مافەکانی خۆی هاتە کایەوە . هەموومان ئەزانین کە گەلی ئێران هەرچەن لەچەن نەتەوەی جۆراوجۆر لە دوو مەذهەبی ئیسلامی پێك‌هاتووە بەڵام لەم‌شورشەدا هەمووی دەستی دایە دەستی‌یەك وەبڕێ لەپارتە ئاینیەکان بەتایبەت موجاهیدین کەئیستە دەرکراوو ئاوارەن ڕێکخراوی ڕێکوپێکیان‌بوو وەبەهەموجۆرێ دەس‌باشیان لە ڕژێمی شا ئەوەشاند بەڵام لەگەرمەی سەرکەوتنی‌و شۆڕشا مرۆڤە ئاینیەکان ووردە ووردە شۆڕشەکەیان لەدەستی گەل وەرگرت‌و خۆیان کردە خاوەنی . ئەبێ ئەوەش بزانین کە مەلا شیعەکان لە ئێرانا ، واتا (ئاخوند) بەپێی کەمیترین سەرژمێری لە (٢٠٠) هەزار کەس زیاترن ئەمانە ئەگەر هەر کەسێ سەد کەسی بۆ بخەڵەتێ ئەکاتە (٢) ملیۆن کەس ئایا لە جیهانا لە ووشەی ئاین شیرینتر هەیە بۆ ئەوانەی کەلەدڵا باوەڕیان بە ئاین هەیە ؟ بەتایبەت مرۆڤی ساویلکە کە باوەڕەکەی باوەڕێکی تەقلیدی‌یە واتە باوەڕی کوێرکوێرانە . جا دەستەی‌ئاخوند واتە مەلای ئێران کەڵکیان لەباوەڕی پاکی خەڵکی ساویلکەو دێ‌نشینەکان وەرگرت‌و وە بەچی دەستیان بە دەست‌بڕین‌و عەوام خەڵەتاندن کرد ؟

بەوشەی‌شیرینی ( دین ) بەڵێ ئاخوند دەستی کێشا بەسەر شۆرشاو چەکی دینیشی گرت‌بەدەستەوە . تا ئێرە هیچ عەیبێکی‌تیانیە وەدین شتێکی‌تازەوغەریب نەبوو بەڵام کەم‌کەم هەموو خاوەن‌بەشێك وەهەموو مافخوازێك رووی‌نایە تاران‌و داوای مافی خۆی کرد کە کوردەکانیش یەکێك لەم‌خەڵکە بوون کوردەکان بوونە سێ دەستە . یەکێ روناك‌بیران کە لەپارتی‌دیموکراتی کوردستانی ئێران‌و دەستە ناوەندی‌وچەپەکان پێك‌هاتبون . دوهەم لاین‌گرانی دین بەڵام لەسایەی خومەینیدا . سێ‌هەم ئەولاین‌گرانەی‌دین کەسەر بەکوردەکان‌و چەپەکان‌بوون . جا ئەو دەستە لاین‌گری دینەی کە سەربە خومەینی بوون کە لە تاران گەرانەوە بۆناو کوردان بەتایبەت لە شاری سنە موژدەی سەربەخۆیی ئیسلامی‌یان بەکوردا ئەدا ئەیان‌ووت ئەمەتا فەرمانی ئۆتۆنۆمی خومەینی والەگیرفانمانا بەڵام ئەو دو دەستەکەی‌تر کەم‌کەم لەگەڵ‌رژێما کەوتە بەینیان تاگەیشتە مۆربونەوە لەیەکتر وەئاخرەکەی کەوتنە لێك‌دان . بەڵێ بەداخەوە زۆری‌نەخایاند کەخومەینی بەیارمەتی پێشمەرگەی موسڵمانی کورد بەربووە گیانی کوردان . ئەوەی لەدەستی هات دریغی نەکرد . تا ئەو دەمە کەس نەیدیبو کە لە شوێنی وەك پاوەو مەریوانا کەس بدرێ‌لەدار بەڵام خومەینی خال‌خالی نارد بۆئەوەی کە مافی کوردان بدات وە هەرکە گەیشتە فرۆکەخانەی شاری سنە لە ماوەی نیو سەعاتا تافرۆکەکە بۆ گەرانەوە رێك‌کەوتەوە نۆکەسی دادگا کردو تاوان‌باری کردن‌و گوللەبارانیشی کردن کەسیانیان برابون واتا ناهد عەلی شهریار کە دایکیان بێکەس بوو بە بێوەژنی بەخێوی کردبوون وە ئەو دیمەنە دڵ‌تەزێنە وێنەی لێ گیراوەو لە جیهانا بڵاوبووەوە . پاشان رۆیشت بۆ پاوەو لەوڵیش نزیکەی (١٠) کەسی لە رۆشنبیران نایەوە بۆگوللەی‌پاسداران وەهەڵ‌گەرایەوە بۆ مەریوانیش لەوێش ئەوانی‌قەلاچۆکرد . لەپاشان لەسەقز مهاباد بانەو سەردەشتا لاوان‌و روناك کبیران نرانەوە بۆگوللەی پاسدار بەرادەیێك ئەم بەناو موسوڵمانانە لەکوشتن‌و بۆمباران‌کردنا بێ‌باکو بێ‌وجدان‌بوون بەرادەیێك گەر شا بگەرایایەوەو پێیان بووتایە ئائەمانەبوون کەوایان بەسەرتاهێنا باورناکەم وای لێ‌بکردان . ئەبێ بزانین کە تا ئێستەش ئەم‌کوشتن‌وبرینە هەر بەردەوامە ئەبێ بزانین هەرچی شاری کوردە هەموی سوتێزاو بۆمباباران‌کراو نابوت‌کرا . ئێستەش رۆژ نیە شارو گوندی کوردان لەژێر زەبری تۆپ‌و گوللەدا نەلەرێتەوەو دەیان رۆڵەی کورد لەخوێنی خۆیا نەگەوزێتەوە . جا بە هۆی ئەم ئاکامەوە دەستەی لاینگرانی خومەینی لە کوردان روزەردی بەردیوانی گەلەکەیان بوون‌و ئیتر رویان نیە خۆیان‌دەرخەن‌و بێنە ناو خەڵك وەلای خومەنیش چاوبزیان لێ‌کراوەو دەرکراون . هەروەها بلوجەکان‌و تورکمەنەکان‌و عەرەبەکانیش لە کوردان خرابتریان لێ‌کرا . تورکەکانی ئاذەربایجانیش کوترانەوە ناوقاڵبی‌خۆیان‌و سەرۆکەکەیان کەشریعەتمەداری‌یە دەس‌بەسەر کرا هەروەکو سەرۆکی عەرەبەکان کەشوبەیری خاقانی‌یە کەسەرنوقم‌کرا وەهەروەکو آیت‌الله‌طالەقانی کەپێشەوای رۆشنبیران بوو کەدەرمان‌خوارد کرا . جا پاش ئەمە ئێستە بزانین ئازادی‌و دیموکراسی چی‌یان بەسەرهات ؟ بزانین مافی ئافرەتان بەکوێ گەیشت ؟ بزانین دادگەو دادپەروەری چ‌بەڵایێکی بەسەراهات ؟ بزانین ئەو سەدو شەست زانستگەو کۆلێژو خوێندنگە بەرزانە چی‌یان لێ‌هات ؟ ئاورێك لەدەهاهەزار خوێندکاری سەرگەردان بدەینەوە کەبەرژێمی پێشوو رازی نەبوون سەیرێکی باری کارخانەکان‌و کرێکارەکانیان بکەین سەیرێکی کشتگەکان‌و جوتیاران بکەین بەراوردێکی باری دیموکراسی ئیسلامی‌و رژێمی‌دیکتاتۆری بکەین سەیرێکی روژنامەو گۆڤارو چاپخانەکان بکەین . تابۆمان دەرکەوێت کە بەراستی ئێران بەم‌رژێمە تازەیەوە گەیشتوتە کوێ ؟ .

سەبارەت بەئافرەتان ئەوەتا کەرژێم گەراوەتەوە بۆسەردەمی شارینەوەی ژنان . لە سەرەتای شۆرشا پاسدارەکان پەلاماری ژنەسفورەکانیان داو زڵفیان‌برین ئەم‌کارە بووە هەلایێکی جیهانی رژێم‌ناچار داوای لێ‌بوردنی کردو ووتی تەنها ئەوژنانەی کە لە میریدا ئیش‌ئەکەن ئەبێ سەرپۆشیان هەبێ‌و ژنانی‌تر بە ئارەزوی خۆیانە بەڵام ئیستە دەوڵەت کاری گەیاندوەتە رادەیێك کەمانگی لەمەوپێش دادسێنی گشتی «المدعی العام» رای‌گەیاند هەر ژنێك بە سفوری بسورێتەوە ئەدرێتە دادگەو ئەخرێتە زیندان هەروەها هەر تەکسی‌یێك ژنی‌سفور سوارکات بەتاوان‌کار ئەناسرێت بەڵێ ئەمەتا پاداشی ئەوژنانەی کەسینەی‌خۆیان کردەقەڵغان بۆخزمەتی‌شۆرش رۆڵەکانیان هان‌ئەدا لەگوللەی شا نەترسن . کەچی ئیستە ژن لە ئێرانا بووەتە کوتاڵ مەتایێکی لەباوکەوتوو وەسەرلەنوێ داپۆشراوەتەوە .

بەڵام خوێندکاران‌و قوتابیان‌و ئەوانەی کەوەکو زەردەواڵە لە رژێمی شا ووروژابوون‌و کونە مشکیان لێ‌کردبووە عەمارەت‌و دارو دیواری دانشگاکا نیان کردبووە دروشم ئەوانەی کەخوێنیان رژایە بەر دەرگای دانشگەی تاران ئەوانیش وەك ماسی لەئاو بکەی وەك گیان‌دار لەهەوا دوورخەیتەوە هەموو

کوژراکاون هەموو لەخوێندنو خوێندنگە براون پتر لە سەدوشەست دانشگەو کولێژی ئێران بەسراون ئەویش هۆیزۆری بۆ هەیە یەکێ لەو هۆیانە ئەوەتە کەئاخوندەکان نایانەوێ جگەلەوکتێبانەی کەخۆیان سانسۆریبکەنو مەبەستەکانی تیا دەسچنکەن نابێکتێبیتر بخوێنرێت واتا . وەکو ئاخوندەکان ئەڵێن : نابیمەبەستی شەیتانیتیابێت وەئەمەش ماوەیئەوێت تائەم هەموەکتێبە دانرێت . وەنابێ کوڕوکچ پێکەوەبخوێنن کچ نابێ بێتە ئەندازیار . لاێیکیتریش مەبادا ئەملاوانە کە کەوتنەیەك سەرلەنوێ خۆپیشانданو مانگرتنو دەربرینی دەردی گەل دەسپێبکاتەوە . سێهەم کردنەوەی دانشەکان سەرمایەیئەوێ . کەنیە . ماموستایئەوی . کەنیە . وە ماموستاکان تانە کوژراون تانە دەرچوون تانە نازانن کەئەمدەرسانەی ئیستەیرژم بڵێنەوە . چوارەم ئەیئەگەر ئەم هەموولاوە بڕۆنە دانشگەکان ئەی کێ بۆشەڕ بڕوات بەڵێ بەمچەشنە ئیستەلەئێرانا هەموی دانشگەکان کە پترن لەسەدوشەست بەسراون وەسێساڵە کەسێلەدانشگە دەرنەچووە .

کارخانەکانیش ئەمڕۆ لەصەدا نەوەدیان بەسراون چونکی خاوەنکارخانە دەرچوە ئەندازیارەکان دەرچون کەرەسەیخام دەستی ناکەوێ دەوڵەتیش کارناسوپسپۆڕی نیە . کاکی ئاخوندیش شارەزای ئەمجۆرەئیشانە نیە دیارە کەسیش تاقەتی ئەوەی نیە کارخانە بۆ دەوڵەت ببابەڕێوە جا ئەمە بووەتە هۆیئەوەی کەئیستە پتر لە چوار میلیون کەس بێکارو بێبارو سەرگەردانبن .

باری کشتگەکانیش لەهی کارخانەکان خراپترە بەتایبەت چونکی کشتگە گەورەکان لەم دوایەدا هەموی کرابونە کشتیمەکینەیی و لەئاکاما کەخاوەن کشتگە سەریان لێشێوا دیارە زەویوزاریش بەرەلایەو هەموسایەقو مەکینەچیو کرێکارانیش بێکارو سەرگەردان ئەبن .

بەلام دیموکراتیەت لەهەموی ماڵوێرانترە هەر کەسێ فرزەی لێوەبێت خێرا بەناوی دوژمنی خواوە گیانی لەکونەلوتیەوە دێرنەدەر جا ئەگەر ئینسان دوژمنیمەخلوقبێ ئەکرێ دڵیێ بێرێتەوەجێ بەلام کێ دەسئەگاتە لایخوا تاداوای لێبوردنی لێبکات . ئەمەش بەو بۆنەوەیە ( کەخومەینی جێنشینی ئیمامی زەمانەو (ئەویش) جێگری حەزرەتی محمدە (ص) ئەویش پەیامبەری خودایە کەواتە سەربادان لەفەرمانیمیری سەربادانە لەفەرمانیئیمام واتەدەنگهەڵبڕین ئەکاتە مەرگ . لە لایێکیتریشەوە چون خومەینی خاوەنی پایەتی ویلایەتیفەقیهە ئیترکەسێ کەخاوەنی ئەوپایەبەرزەبێت خواخۆی لەهەموشتێك شارەزایئەکات کەوابو نابێکەس لەفەرمانی دەرچی . واتە رژێمی تەكڕەوی (فەردی) دیکتاتۆری کەبەئیشارەی پەنجەیێکی سەرکۆمارو سەرەكوەزیرو کۆڕینوێنەرانیگەلو هەموشتێ تێكئەدرێ بەیەکا . هەموی ئەمتاوانانەش بەناویئیسلامەوە وەلەژێرپەردەی ئیسلاما تەواوئەکرێت وەئابڕوی ئیسلامی پێئەبرێت .

بەمچەشنە وەبەپێی لیستەیێك کەلەئەوروپادالەلاینی مەسعودیرەجەوییەوە بەناوو ناونیشانی کوژراوەکانەوە بلاوکرایەوە لەماوەی شەشمانگی ڕابوردودا پانزە هەزار کەس لە سێدارە دراون کە ئەمکارە ڕوی هەلاکۆی سپیکردووە ئیترئەمە جگەئیعدامەکانی سێساڵی ڕابوردو وەجگەئەوهەموە کوشتوکوشتارەی کەبەفڕۆکەو تۆپو تانگ لەگەلیکوردو گەلانیتریئێران کراوە . ئەبێئەوەش بزانین نەحیزبێك هەیەو نەروژنامەیێکی ئازادو نەچاپخانەیێك کەجاران تەنها لەتارانا نزیکەی سەدجۆر ڕوژنامەو گۆڤار لەچاپئەدرا کەئەگەر هەموشتێك نەنوسرایی زۆرشت ئەنوسراو کەچیئیستە بەهەمویەوە پێنجشەش ڕوژنامەوگۆڤار دەرئەچن کەجگەباسی خومەینیو ناویخومەینی نەبێت هیچیکەی تیانابینرێت لەسەردەمیشا خراپتر . لەکاتێکا ئەو لابرا کەدیکتاتۆربوو وەئەم هێنرا کەدیموکراسیبێت کەچی وایلێهات .

جائەمەخومەینیو دەسەلاتی خومەینی بەجێگەی خۆی هەرچی کارو لێپرسراوەی گەورەشە هەموی دراوەتە سەرکۆمار سەرەكوەزیر کۆڕیوەزیران . لەسەدانەوەدی نوینەرانیگەل . لەصەدانەوەدی دادسێنیگشتی پارێزگارەکان لێپرسراوانی سیاسیئیدیولوژیکی سوپاکان فەرماندەرانی سوپایپاسداران . هەموی هەرئاخوندەو ئاخوند جاوەرە سەیری ئەم بەزمەو ئەمعەدالەتە ؟

بەڵێ ئەمەتا چمکێك لەباری ئێرانیئەمڕۆ ئەوئێرانەی کەچوارساڵ لەمەوپێش ڕاپەڕی بۆئەوەی کەفریشتەی دادگەری بگرێتەباوەش تاعەتریئازادی پڕبەسینەی هەڵمژێ تاماف نەتەوایەتی کەمایەتیەکانی بیرێتەدەس تارژێمی دیکتاتۆری بروخێنێتو ڕژێمی دیموکراسی دامەزرێنێت بەلام بەداخەوە دیکتاتۆری تاجبەسەر لاچوو دیکتاتۆری مێزەرەڕەش هاتەجێگای ئەو بەناوی ڕژێمیپادشایی دیموکراتیەوەو ئەملەژێرپەردەی ناویپیرۆزی ئیسلاما .

# خزمایەتی لەزمانا

دکتۆر وریا عمر امین – بەشی کوردی
کولێجی پەروەردە – زانستگای بەغدا

هەبوونی ژمارەیێکی زۆر زمانی جیاواز جیاوازو نەبوونی تاکە زمانیٚ بۆ هەموو ئادەمیزادانی سەر ڕووی زەمین هەر لە زووەوە سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشاوەو بیری خەریك کردووە . ئەو نەزەریانەی هەزارەها سالٚ پێش ئیمڕۆ دەربارەی ئەم دیاردەیە هەبووە ، بەڵگەی بایەخ پیٚدانو خەریك بوونی بیری ئادەمیزادە بەم مەسەلەیەوە . بۆ گەڕان بە شوێن تەفسیری ئەم جۆرە دیاردانە . . وەك هەر نهێنییێکی سروشتی تر – لە بیٚ دەسەلاتی پەنا ئەبرایە بەر ئەفسانە .

تەورات کە مێژووی ئەگەڕێتەوە نزیکەی هەزار سالٚ پێش زایین ئەم چیرۆکە ئەگێڕێتەوە : (سەردەمیٚ ئادەمیزاد هەموو بە یێك زمان ئەدوان . . گەیشتبوونەلووتکەی شارستانییەت . . یەك شت مابوو بیکەن . . ئەویش ئەوە بوو بگەنە لای خوا . . بۆ ئەم مەبەستە ویستیان تەلارێکی بەرز دروستکەن . . خواش ، بۆ ئەوەی ئەمەیان بۆ نەکریٚ ، سزایدان . . زمانی شێواندن ، هەر یەکە بەجۆریٚ قسەیکرد . ئیتر لەیەك نەگەیشتن . . ئەمە بووە هۆی ئەوەی نەتوانن ئەم پڕۆژەیە بەجیٚبهێنن . .) .

ئەمە یێکێکە لەو چیرۆکانەی هەولٚ ئەدەن ئەم دیاردەیە تەفسیربکەن . تا سەدەی هەژدەمیش هۆی لەیەكچوونی دوو یا کۆمەڵە زمانیٚ ئەدرایە پالٚ کار لەیەك کردنو لەیەك وەرگرتنو ڕێکەوت .

سێر ولیەم جۆنس – زمانەوانێکی بەریتانی سەدەی هەژدەمە – لە هیند ئەژیا شارەزاییێکی تەواوی زمانی گریکیو لاتینی هەبوو . کە فێری زمانی سەنسەکریتی بوو ، بینی ئەم سیٚ زمانانە زۆر لەیەك ئەکەن لە ڕووی دارشتنی ڕەگی فرمانو ناوو ڕێزمانیانەوە . لە سالیٚ ١٧٨٦ ووتارێکی بلاو کردەوە ئەم لێکدانەوەیەی تیا پێشکەشکرد .

(گریمان لاتینیو گریکی لە یەك ئەکەن چونکە لە ڕووی

جوغرافی‌یەوە گەلیّ لەمیّژە دراوسێن‌و کاریان لە یەك کردووە . . ئەی زمانی سەنسەکریتی ، کە هەزاران میل لیّ‌یانەوە دوورە ئەم لەیەك‌چوونەی چۆن پەیا کرد ؟ بە هیچ جۆر ناشیّ ئەم دیاردەیە بخرێتە پالّ رِێکەوت . هەبیّ و نەبیّ ئەم سیّ زکانانە لە یەك سەرچاوەوە هەلّقوولاّون . .) .

ئەم رِایە تازەیە دەرگایێکی فراوانی لە ئاسۆی زمانەوانیدا کردەوە . زمانەوانانی جیهان لەسەر ئەم بیناغەیە لە زمان ئەکۆلّینەوە . خەریکی شی‌کردنەوە و بەراووردکردنی زمانان بوون بەو ئاواتەی پەیوەندی و جۆری خزمایەتی نێوان زمانەکانی جیهان بدۆزنەوە . . سەدەها زمان کە هیچ شتیّ دەربارەی نژادو پەیوەندی‌یان نەئەزانرا ، لە ئەنجامی ئەم جۆرە لێکۆلّینەوەیە ، شوێنیان لە ناو زمانانی جیهان بە تەواوی دەس‌نیشان‌کرا .

ئەم جۆرە لێکۆلّینەوەیە لە کاتێکا باوبوو کە نەزەری‌یەی پەرەسەندنی داروین (١٨٠٩ – ١٨٨٢) کاری لە هەموو لایەنێکی زانست ئەکرد . زانستی زمانیش لەم کارتی‌کردنە بیّ‌بەش نەبوو . لە ئەنجاما ئەم راستی‌یە سەری هەلّدا (چەمکی گۆرِینە هۆی هەبوونی ژمارەیێکی زۆر زمانی جیاواز جیاواز)

گۆرِین یاسایێکی ئەزەلی‌ی ئەم سروشتەیە باری ئیستەی هەر شتیّ جیایە لەهی هەر سەردەمێکی تری بیئە envronment دەورێکی بالاّ ئەگێرِێت لە ئاراستە کردنی شێوەی گۆرِین . . واتا گەر هەمان سیستەم خرایە دوو بیئەی جیاواز ، پاش ماوەیێك شێوەی جیاواز ئەگرنە خۆ و ئەبیّ بە دوو سیستەمی جیاواز . زمانیش وەك دیاردەیێکی سروشتی لەم یاسا گشتی‌یە بەدەر نی‌یە . ئەگۆریّ بە تێپەرِینی کات باری جوغرافی‌و ئابووری‌و کۆمەلاّیەتی‌و کەلچەری‌و پەیوەندی لەگەلّ زمانانی تر دەورئەگێرِن لە چوێنەتی شێوەگرتنی ئەم گۆرِینە . بۆ روون کردنەوەی ئەم لایەنە بابلّێین کۆمەلّە خەلّکیّ بە زمانی (ز) ئەدوان لە ناوچەی .




بە تێپەرِینی کات ئەم زمانە ئەگۆرِیّ . ئەگەر قسەکەرەکانی هەموو بەیەکەوە مانەوە و پەیوەندی‌ی جوغرافی‌و کۆمەلایەتی نێوانیان نەپچرا ئەوە گۆرِینەکە لە هەموو بەشەکانیا هەمان شێوە ئەگرێتە خۆ چونکە بە هەمان بیئە ئابلّۆقەدراوە . بەلاّم ئەگەر هات‌و ئەم کۆمەلّە خەلّکە لەیەك دابرِان‌و بوون بەچەن بەشیّ چ لە ئەنجامی کۆچ‌کردن یا پەیا بوونی سنوورێکی سروشتی یا دەسکرد لە نێوانیانا .




پەیوەندیی نێوانیان ئەپچڕێ . لە کاتی لەیەك دابڕانییان ، بێگومان ، هەموو هەمان شێوەی قسەکردنیان ئەبێ . دوای جیابوونەوەیان هەر یەکە ئەکەوێتە بینەی تایبەتیی تازەی خۆی . زمانەکە ئەگۆڕێ بەڵام چونکە ئەمجارە بەشەکانی بەیەکەوە نین گۆڕینەکە لەهەر بەشێکیا شێوەیێکی جیاواز لەوانیترا ئەگرێتە خۆ . . هەر یەکە بەپێی ئەو بینەیە تازەیەی کەوتۆتە ناوی . پاش ماوەیێك ئەبن بە چەن شێوەیێ .

چەن زیاتری بەسەرا تێپەڕی جیاوازیی نێوانیان زۆرتر ئەبێ تا ئەگاتە ڕادەیێك ئیتر لەیەك ناگەن . بەم جۆرە زمانی (ز) دوای چەن پشتێ ئەبێ بە چوار زمانی تازە .




زمانی (ز) خۆی وەك زمانێکی زیندوو نامینێ (لەوانەیە لەنووسینا بپارێزرێ . بەم جۆرە زمانانە ئەووترێ زمانی مردوو) . ئەو زمانە تازانە دیسان بە هەمان ڕێڕەو تێئەپەڕنەوە و بە هەمان جۆر ئەبن بەچەن زمانێکی تر و بەم جۆرە . (ز١) (ز٢) (ز٣) و (ز٤) خوشکن (ز) دایکیانە . بەری (ز١) ئەبن بە پوورزای بەری (ز٢) . . و بەم جۆرە . (ز) ئەبێ بە بنەماڵە .



جا كه ئەلێین فلانە زمانو علانە زمان سەر بە هەمان بنەماڵەن ئەوە ئەگەیەنێ كه ئەم دوو زمانانە – بەو جۆرەی باس‌كرا – لەیەك سەرچاوەوە هاتوونەتە خوارەوە و پەیوەندی‌ی خزمایەتی (دوور یا نزیك) لە نێوانیانا هەیە . بۆ نموولە زمانی كوردی و ئینگلیزی و ئوردوو و پشتۆ . . هەموو سەر بەو بنەماڵەن كە بە هیندو – ئەوروپی ناوبراوە .

كوردی و پشتۆ خۆشكن – هەردووك بەرەی هەمان زمانن كە بە (ئاری) ناوبراوە . ئوردوو پوورزایانە – واتا دایكی ئوردوو كه (سەنسەكریتی) یە و دایكی كوردی و ئوردوو كه (ئاری) یە خوشكن . دایكی (ئاری) و (سەنسەكریتی)یش بە (هیندو – ئاری) ناوبراوە .

زمانی ئینگلیزی زمانێكی (جەرمەنی)ی رۆژئاوایی‌یە . جەرمەنی رۆژئاواییش لە جەرمەنی‌یەوە هاتۆتە خوارەوە . . (جەرمەنی) و (هیندو – ئاری) خوشكن هەر دووك بەرەی هەمان زمانن كە بە (هیندو – ئەوروپی) ناوبراوە . پەیوەندی نیوان ئەم چوار زمانانە و هەندێ لە زمانەكانی تری هیندو – ئەوروپی لەم وێنەیەدا روون كراوەتەوە .



هیندۆ - ئەوروپی
هیندۆ - ئاری
سلاڤی
هێلینی
جەرمەنی
سەنسکریتی
ئاری
بەڵتیکی
گریکی کۆن
باکووری
فارسی
پەشتوو
بلوچی
کوردی
لاتڤی
لیتوانی
ئەرمەنی
ئەلەبانی
گریکی
ئینگلیزی
بەنگالی
هیندی
پەنجابی
ئوردوو
بولگاری
چیکی
مەسەدۆنی
پۆڵۆنی
ڕووسی
سیربۆکرێتی
سلۆڤاکی
سلۆڤانی
ئۆکرانی
ئایسلەندی
نەرویجی
سویدی
دانمارکی

هەموو زمانەکانی تری جیهان بەم جۆرە ، لەسەر بناغەی پەیوەندیی خزمایەتی و هاورەگەزی هەر کۆمەڵەی ئەبێتە بنەماڵەیێك .

لەبەر جیاوازی و پێك نەهاتن لەسەر پێناسینی چەمکیی زمان و پەیوەندیی زمان بەخێرەوە و گۆرینی ژمارەیان بە تێپەرینی کات زۆر زەحمەتە ژکارەی زمانانی جیهان بە تەواوی د س نیشانبکرێت . را جیاوازەکان لە نێوان سێ هەزار و چوار هەزار و پێنج سەدا ئەخولێنەوە . لەم ووتارە جیّی ئەمە نابێتەوە بە فراوانی لەم مەسەلەیە بکۆلرێتەوە .

جگە لە بنەماڵەی هیندو ئەوروپی چەن بنەماڵەیێکی ترو زمانە بەناوبانگەکانی تیایانا پێشکەش ئەکەین .

| بنەماڵە | هەندێ لە زمانەکانی |
|---|---|
| سامی/حامی | عەرەبی-ئەمهاری-هەوسە- عبری-سومالی . . |
| ئەلتایکی | یابانی - تورکی - مەنغۆلی کۆری . . |
| درافیدی | تامیل - تیلەگو مەلەیالەم - کەننەدا . . |
| ئۆرالی | فنلەدی - هەنگاری ئیستوانی . . |
| قەفقاسی | ئەفار - جۆرجی . . |
| حینۆتیبی | بورمی - کەنتانی مەندەرانی - تیبی . . |
| ئۆسترۆ - ئەشیتیك | کەمبۆدی - ڤیتنامی . . |
| ئۆسترۆ - تای | جاوی - ئەندەنوسی مەلەگاسی - تەلەگۆك تایلەندی . . |
| نایجرکردۆفانی | سواهیلی ئیگبۆ - زوولور یوروبا . . |
| هیندەمکریکی | ئەرەپاهۆ ئۆجیبوا - ئەپاچیێ |
| | سارسی - مایا - بیا موهاڤ - هۆبیێ . . |
| هتد | |

ئایا ئەم بنەماڵانەش - لە قوناغیێ یا چەند قۆناغێکی ژوورتردا ئەگەنەوە یەك ؟ گەیشتنەوە یێکیان ئەمە ئەگەیەنێ کە هەموو زمانانی جیهان لە یەك سەرچاوەوە هەڵقووڵاوێت . گەر ئەمە ساغ بکرێتەوە گرێیەکی بەگجار ئالۆز لە نهێنیەکانی سروشتمان بۆ ئەکرێتەوە . چونکە زانینی نژادی زمان تیشك ئەخاتە سەر زانینی نژادی ئادەمیزاد .

## سەرچاوەکان


1 – Crystal, D. (1971) Linguistics

2 – Kondratov, A (1969) Sounds and signs Mir publishers Moscow

3 – Gleason, H.A (1965) An Introductin to Descriptive Linguistics

4 – Bynon, T. (1977) Historical Linguistics Cambridge




# هەڵسەنگاندن و ڕەخنە لە کتێبی کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردی

نووسینی: عبدالستار کاظم
گۆڕینی: بیمار

لە لاپەرە (۱۰۹)دا
باسی بابەتێکی گرنگی ڕێزمانی کردووە زۆرکەم لە باسکەرانی خۆمان لێیان کۆڵیوەتەوە بۆیە جێگەی سوپاسە، بەڵام وادیارە لەم بوارەدا هەندێ سەرەداوی لێ ئاڵۆز بووەو بەگەرمی وەستوویەتی هەندێ شتی وا بچەسپێنێ کە لە زەوی زمانەوە دوورن..

١ – دەیەوێ بیچەسپێنێ کە مۆرفیمی دووبارە کردنەوە دەچێتە سەر ئاوەڵناو، ئەوەی لە یاد نەماوە کە دووبارەکردنەوە لە (کار) نەبێ لە هیچ جۆرێکی تر روونادات.. چونکە هەر قەوماو دووبارە دەبێتەوە، بەڵام ئاوەڵناو چونکە قەوماو نی‌یە ئیتر ناکرێ دووبارەبوونەوەی تێدا بێت، (ناو)یش هەر بەم جۆرە وایە. هەرچی ئەوەشە کە سەرنجی بوونی مۆرفیمی دووبارەبوونەوەی لە هەندێ حاڵەتی وا داوە کە لە «فعلیەتەوە» گوێزراونەتەوە بۆ «وەصفیەت» ئەمانە جۆرە حاڵەتێکی تایبەتین‌و پێشتر دەستم بۆ ڕاکێشان.

ئەوەی زانراوە ئاوەڵناو لە کوردیدا یان لە بنچینەوە چەسپاوە وەکو (زەرد، سوور) یان نەچەسپاوە وەکو ناوی بکەر و مەفعوول، ئەم ئاوەڵناوانەش کە چەسپاون بەو مانایە کە وەکو بەشێکی جیانەکراوەی وەسف‌کراوەکەن. کە دەڵێین پیاوی درێژ، ووشەی درێژ سیفەتێکی چەسپاوە بە پیاوەکەوە.

هەرچی نەچەسپاوەکەشە ئەوا ئەو سیفەتەیە کە لەوانەیە نەمێنێ وەکو دەڵێین (منداڵی نوستوو)، لێرەدا سیفەتی (نوستوو) لەوانەیە لە منداڵەکە بڕەوێتەوە.

ناوی بکەریش لە زمانی کوردیدا ئاوەڵناوێکی نەچەسپاوە ناتوانرێ بکرێ بە چەسپاو، کەچی ناوی کراو وانی‌یەو دەتوانرێ بگۆردرێ بە ئاوەڵناوی چەسپاو ئەمەش بە لکانی بزوێنی (ە) پێیەوە، ئەوسا ئاوەڵناوێکە لە ناوی کراو دەکات چونکە چەسپ بووە، وەکو: خوێنراو، سیفەتێکی نەچەسپاوە، بەڵام (خوێنراوە) سیفەتێکی چەسپاوە (سیفەتێکی موشەببەهە بە ناوی کراوە). لێرەشدا لەنگەری دەنگ (نەبر) دەتوانێ ئاوەڵناوی لە ناوی کراو چوو لە دارشتەی کاری ڕابردووی نزیکی مەبنی مەجهوول جیا بکاتەوە.

٢ – مامۆستا لێی‌تێك‌چووە وای‌زانیوە ئەو (وە)یەی دوای شکا، سوا... هتد (ل. ١١٠) هاتووە مورفیمێکە مانای دووبارەکردنەوە دەدات، لەکاتێکدا ئەو واوەی بەو کارانەوە نووساوە نیشانەی ناوی کراو ناوی بکەرن.. هەرچی بزوێنە (ە)شە ئەویش نیشانەی سیفەی موشەببەهەیەو بەشێك نی‌یە لەو مۆرفیمەی کە وایزانیوە بۆ دووبارەکردنەوەیە.

٣ – مامۆستا هەستی بە جیاوازیی نێوان سیفەتی لە ناوی بکەر چوو لەگەڵ ناوی بکەرو ناوی کراو کردووە، ئەمەش شایانی سوپاسە، بەڵام وابزانم نەیتوانیوە ڕاستی‌ی هەردوو دارشتەکە دەربڕێت.

٤ – ئەوەی زیاتر کارەکەی لە مومۆستا ئاڵۆز کردووە، ڕوون نەبوونی ئاسۆی ڕشتەی کاری (شکا، سووا..هتد)ە جا بۆ ڕوون کردنەوەی ئەمە دەڵێم:

«کار» لە زمانی کوردیدا یان تێپەڕە یان تێنەپەڕ..

أ – تێپەڕ ئەوەیە کە بکەرەکەی خاوەن ویستە یان لەگوێن دایە ببۆ ویست «ئیرادە» ئەگەرنا لە خۆیەوە نەی‌دەپەڕاندەوە سەر هی‌تر..

ب – تێنەپەڕ: ئەمەش یان ئەوەیە کە بکەرەکەی خاوەن ئیرادەیە وەکو: هات، چوو، نووست، خەوت.. هتد، یاخۆ بێ ئیرادەیە، هۆی سەر لێ‌تێك‌چوونی مامۆستاش لێرەدایە.

ئەم کارانە بکەرەکانیان نادیار دەبن‌و مەفعوول شوێنی بکەرەکانیانی گرتووەتەوە بەڵام بۆ ئەوە ناکەبنە بریکاری ئەوان هەروەکو لەو کارە تێپەڕانەدا ڕوودەدات کە دەبن بە (مەبنی مەجهوول) چونکە لەم جۆرە حاڵانەدا بکەر نادیار دەبێت یان لەبەر هەر هۆیەك بێت حەزناکرێت دەربکەوێت..

بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو کارانە لە ئەنجامی هۆی نەزانراوەوە روو دەدەن‌و ناتوانرێ بکەرەکانیان دیاری بکرێت، هەروەکو کە دەڵێین «پیاڵەکە شکا» گەلێ پرسیارمان دێتە ڕوو ئایا کێ پیاڵەکەی شکاند و چۆن شکاو ئایا خۆی خۆی شکاند؟ وەڵامی ئەم پرسیارانەش هەر نازانمە..

پیاڵە ئیرادەی ئەوەی نی‌یە کە خۆی بشکێنێ‌و ناشزانین کێ شکاندوویەتی‌و چۆن شکاوە.

بکەر لێرەدا مەفعوولیشەو زمان لەیەك کاتدا بەچاوی بکەرو مەفعول سەیریان دەکات . ئەم جۆرە کارانە کاتێك کە واویان پێوە دەنووسێ‌و دەبن بەوەکو (شکاو) ئەوسا ووشە تازەکە لە حوکمی ناوی بکەرو لە حوکمی ناوی کراودا دەبێت ، بەڵام وەکو بۆمان دەردەکەوێ لە هەموو بارێکدا زمان بە چاوی ناوی کراو سەیری دەکات بۆیە لەتوانا دایە (سیفەی موشەبیەهە)ی لێ دابرێژرێت ئەمەش بە زیادکردنی بزوێنی (ە) ئەوسا دەبێ بە (شکاوە)و دەگوترێ گەڵای شکاوە ئەگەر مەبەست دیاریکردنی سیفەتی هەمیشەیی یان چەسپاوی ووشەی گەڵا بێت بۆیە کورد دەڵێ : گەڵای شکاوە و ناڵێت (گەڵای شکاو) چونکە ئەگەر گەڵا شکا ناتوانرێ چاك بکرێتەوە بەڵکو سیفەتی چەسپاوی وەردەگرێت بەپێچەوانەی (بەردی شکاو) چونکە بەرد دەتوانرێ سیفەتی شکاندنی لەسەر هەڵبگیردرێ یان لەسەری چەسپ بکرێت ئنجا ئەودەمە دەگوترێ (بەردی شکاوە) . . .

لەتوانا دایە ئەم کارانە ڕام بکرێن واتا بکرێن بە تێپەڕ ئەگەر (دن) بە دوای چاوگەکانیانەوە بلکێنین ، ئەوسا لە سیفەتی نائیرادەیی دەردەچن‌و سیفەتی ئیرادەیی تێپەڕاندنیان دەبێت .

### ٣ – نیشانەی کاری ڕابردووی نزیك
### لە ئاخاوتنی سلێمانیدا

لە لاپەرە ١١٦ – ١٢١ بەو ناونیشانەی سەرەوە دانەر بە ٨ خاڵ پوختەی ڕای خۆی دەربارەی ئەم بابەتە پیشان دەدات ، لە خاڵی یەکەمدا دەڵێ نیشانە بریتییە لە فۆرمی (وە) و لە خاڵی دووەمدا دەڵێ لە هەندێ باردا نیشانەکە دەست بەرداری بزوێنی دوایی (ە) دەبێ ، جا بەرلەوەی بەناو بابەتەکە بکەوم بە پێویستی دەزانم کە بەرامبەر مانای هەندێ زاراوەی زمانەوانی ڕای خۆم ڕوون بکەمەوە نەکو لەوەی دەیخەمەڕوو ئاڵۆزی هەست پێ بکرێت :

**پێشگر :**

وەکو بزانم بێژەیەکە سەربەخۆ مانایەکی نییەو پێش ووشە دەکەوێت‌و ماناکەی دەگۆڕێت بەبێ ئەوەی دەستکاریی بناغەی ووشە بکات ، نموونەش وەکو : هەڵ ،دا ،ڕا لە ووشەگەلی هەڵکەوت ، داڕزا ، ڕاسپارد . .هتد .

**پاشگر :**

بێژەیەکە سەربەخۆ مانای نییە ، بەدوای ووشەدا دێت و مانایەکی تازەی دەداتێ یان لە دارشتەیەکەوە دەیگۆڕێت بە دارشتەیەکی دی ، بەبێ ئەوەی بناجازیی ووشەکە دەست لێ بدات .

وەکو (ین) لە زێڕین‌دا کە ناوێکی گۆڕی بەشێوە دارشتەیەکی دی .

**ئامراز :**

ئەمیش بێژەیەکە مانای دیارنابێت هەتا بە غەیری خۆیەوە نەگات و لە نێوان هەردوو لای نیسبەتدا نیسبەت دەنوێنێ ، ئیتر ئەگەر دوو لایەکەی نیسبەت پاڵدراوو پاڵ‌پێ‌دراو (مسند و مسندالیه) بێت وەکو (لە هەولێرەوە هاتم بۆ بەغدا) ، یان دوو لایەکەی نیسبەت ئاوەڵناو (صفة)و وەسف کراو بێت وەکو (کچی جوان) یان هەردوولایەکەی نیسبەت (مضاف و مضاف إلیه) بێت وەکو «ماڵی ئازاد» .

**نیشانە :**

ئەو بێژەیەیە کە دەچێتە پیش یان پاشی ووشەو ماناو پەیکەری ناگۆڕێت‌و لە نێوان هەر دوولای نیسبەتدا نیسبەتێك پەیدانا‌کات ، چاکترین نموونەش نیشانەی ڕەفعی فاعلە لە زمانی عەرەبیدا کاتێ دەڵێین «جاء محمد» نیشانەی بۆر لەسەر ووشەی محمد دادەنێین بەڵام ئەگەر لەسەر ووشەکەی محمد وەستاین توانیمان نیشانەکە لابەرین و بڵێین «جاء محمد» ئەم کارەمان نەماناو نەپەیکەری ووشەکە ناگۆڕێت و نیشانەکەش هەچ نیسبەتێکی لە نێوان هەردوولای نیسبەتەکەدا دروست نەکرد .

لە کوردیدا ژمارەیەك لەو جۆرە نیشانانەمان هەیە کەوا باسی هەندێکیان دەکەین :

١ – ئەو بزوێنەی لە شێوە زمانی ئەدەبیی نوێداو لە شێوە زمانی سۆرانیشدا کە بە کاری فەرمانەوە دەنرێ و دەگوترێ :

دانیشە ، هەڵسە ، لەتوانادایە بزوێنەکە لا ببرێت هەروەکو لە شێوە زمانی لوڕی‌دا دەگوترێ : دانیش ، هەڵس .

٢ – ئەو (دا)یەی بەو ناوانەوە دەندرێ کە ئامرازی (جر) یان پێش دەکەوێ وەکو : لە ماڵدام . . پیاو دەتوانێ لای بەرێت وەکو لە هەولێردا دەگوترێ لە ماڵم یان نیشانەکە کورت بکاتەوە بڵێ «لەماڵام» بەبێ ئەوەی زیان بە ماناو پەیکەری ووشەکە بکەوێت .

٣ – (وە) کە بە ناوی (مەجرور)ەوە دەنووسێت وەکو دەڵێین :
لە ماڵەوەم . . لەخۆمەوە هاتم .

**تێبینی :**

ئەو بزوێنەی دەکەوێتە پێش (وە) ئامرازێکی دابڕی نێوان دوو دەنگی میم و واوە .

٤ – (را) لە شێوەزمانی کرمانجی ژووروودا کە شوێن (دا) دەگرێتەوە وەکو دەڵێی لە ماڵرا .

ئێستا دێینەوە سەر باسەکەی خۆمان و دەپرسم ئایا ئەو مۆرفیمەی کە بە (کار)ەوە دەنووسێت تا بیکا بە حاڵەتی رابردووی نزیك نیشانەیە یان پاشگرە بەپێی ئەو پێشدەستی‌یەی پێشانمدا ؟ ئایا (ەوە)یە یان (وە)یە یان تەنیا (و)ە ؟

بەڵام کە دەڵێ نیشانەیەو مەرجی نیشانەش ئەوەیە کە ئەگەر لایبەریت زیان بە مانای ووشەکە نەگەیەنێت کەچی لێرەدا وا دەرناچێت چونکە ئەگەر لایبەریت حاڵەتی کارەکە دەگۆرێت .

هەروەها ئامرازیش نی‌یە چونکە نیسبەتێك لە نێوان دوو نیسبەت پێك ناهێنێت لەمەوە تێدەگەین کە بە راستی پاشگر نی‌یە .

بەڵام کە دەڵێ نیشانەکە ( راستتر ئەوەیە بڵێ پاشگرەکە) (وە)یە پشتگیری ناکەم چونکە هەروەکو خوی دانی پێدا ناوە بزوێنە دوایی‌یەکە هەندێ جار دەتوانرێ لابرێت ، ئیتر مادام لەتوانا دابێ بزوێن لابەرێت و کار لە ماناش نەکات هەروەکو لەو قسەیەی ئەو دەفامرێتەوە کە دەڵێ (هەندێ جار لا دەبرێت) ، لەبەر ئەوەش دانی پێدا ناوە کە بزوینی یەکەم لە پەیکەری ئەو نی‌یە کەوابێت تەنیا (و) دەمێنێتەوە ، کە هەر ئەویش بەراستی ئەو پاشگرەیە کە کار دەباتە قۆناغی یەکەم لە قۆناغەکانی حاڵەتی رابردووی نزیك ، بۆیەش دەڵێم : قۆناغی یەکەم چونکە کار لە حاڵەتی رابردووەوە دەگوێزێتەوە حاڵەتی ناوی بکەر ئەگەر (و)ی بۆ زیادکرا ناگوێزێتەوە حاڵەتی رابردووی نزیك هەتا پاشگرێکی دیکەی نەیەتە سەر کە ئەویش بزوێنی (ە)یە و بەڵگەی کاری بوونە (فعل الوجود) .

قۆناغەکانیش بەزنجیرە وەهان :

(کار + ئامرازی نێوبر + پاشگری (و) + (ە) بزوین – کاری‌بوون) = حاڵەتی رابردووی نزیك .

هات + بۆر یان ژێرێکی کورت بەپێی شێوەکانی زمان + و)ی پاشگر کە کار دەگۆرێ بە ناوی بکەر + کاری بوون هاتووە = Hatuwe یان Hatiwe بەپێی ئاخاوتن ! . .

بەڵام کە دەڵێ جاروبار بزوێنی دوایی لادەبرێت بە هەڵەی دەزانم ، چونکە بزوێنی دواییش وەکو گوتم پاشگرە و ئەگەر لابرێت مانا دەگۆرێت و حاڵەتەکەی دەچێتەوە سەر حاڵەتی ناوی بکەر ئەگەر کارەکە مەبنی مەعلوم بێت ، یان ناوی مەفعوول ئەگەر کارەکە مەبنی مەجهوول بیت یان کارێکی تێنەپەری خۆنەویست بێت ، لەمانەوە تێدەگەین کە ئەو پاشگرە بنچینەیی‌یەی کار بە کاری رابردووی دوور دەگۆرێ لە چاو دیالێکتی سلێمانی‌و دیالێکتی نوێی ئەدەبی بەدوو قۆناغدا تێدەپەرێ ، بەڵام لە ئەردەلانی‌و لوری و دیالێکتەکانی تردا ئەوانەی کە پاشگری (و) بۆ دارشتنی ناوی بکەر یان مەفعوول بەکار ناهێنن ئەوانیش بە هەمان دوو قۆناغەکەدا تێدەپەرێ :

کار + دابر(نێوبر)+پاشگریگ + (ە)یکاری هەبوون ، **بەنموونە** : :

هات + ژێرێکی‌کورت + گ +ە = هاتگە

Hatige

هات + ژێرێکی‌کورت +ی +ە = هاتیە

Hatiye

ئەو لە خاڵی سی‌یەمی پوختەی بۆچوونەکانیدا دەڵێ (لەگەڵ تێپەرداو بەبێ راناوی بەرکار دەپسێتەوەو راناوەکە نێو خۆی دەگرێ .)

واتا لەگەڵ کاری تێپەردا ئەگەر مەفعوول دیار نەبێت ئەوا (و) و (ە) لێك جیادەبنەوەو بەرناڤی بکەر دەکەوێتە نێوانیان وەکو (خواردوومە) .

ئەم سەرنجە زۆر راستەو ئەوە ساغ دەکاتەوە کە (و)ەکە پەیوەندی بە (ە)ی بزوێنەوە نی‌یە ، بەڵکو هەریەکەم دەوری خۆی دەگێرێت ، ئەمەش لە دیالێکتەکانی تردا لادەبرێت ، دەگوترێت : خواردگمە ، خواردیتە .

لە سنووری تێپەریشدا ناوەستێ ، بەڵکو لە تێنەپەریشدا هەر هەیەو دەڵێن :

هاتگمە ، هاتیتە .

لە خاڵی چوارەمدا دەڵێ : ( لەگەڵ ئەو کارەدا کە کۆتایی بە

(وو)ی درێژە ، کورتی هەڵ دەهێنێتەوە وەك (بووە) . ئەمەش پێویستی بە درێژە پێدان نی‌یە و بای خۆی بە چاکی باسم کرد ، کە پوختەکەی ئەوەیە کە ئەو دەنگەی لامان وایە واوی درێژە لە بنەرەتدا دەنگێکە لە بۆرێکی کورت و واوێکی کۆنسەنەنت پێك دێت ئەگەر دەنگێکی کۆنسەنەنتی لە پێشەوە بوو . بەلاّم ئەگەر لە سەرەتای برگە یان ووشەوە بوو ئەوا لە واوێکی کۆنسەنەنت و بۆرێکی کورت پێك‌دێت . .(ی)ی درێژیش هەروەکو ئەو وایە . .

خاڵی پێنجەمیش لە مەبەستی خاڵی چوارەم تی‌ناپەڕێ ، لە خاڵی شەشەمیدا وای دەردەبڕێ کە لەگەڵ ئەو کەسانە نی‌یە کە ناوی دەنێن پاشگر (واتا بە نیشانەی دادەنێ) کە ئەمەشم لەمەوبەر روون کردەوە .

خاڵەکانی تریش هەر لەم دەورو بەرانەی سەرەوەدا دەخولێنەوە ، تەنیا یەك شت ماوە کە هەندێك کەس ئەو (ە)یەی بە کاری رابردووی نزیکەوە (لە کاری تێ‌پەڕدا) دەنووسێت بە مەفعوولی دادەنێن ، ئەمەش بە هەڵە چوونەو قسەیەکی بێ پشت‌وپەنایە ، من دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی کاك ئالانی . .

**نیشانەی رابردووی نزیك لەگەڵ ئامرازی «ە»ی پەیوەندیدا :**

بەم ناونیشانە ، دانەر بە درێژی لە ژمارەیەك نموونەی کۆڵیوەتەوە و پوختەی بۆ چوونەکانی ئەوەیە کەوا (ە) بزوێن لە رستەی (گەیشتنەجێ)دا حەرفی جەرە نەکو ئامرازی (تعلق)ە بەمانای (ئە) .من نە دژی ئەم قسەیەمو نە دژی ئەو رایەی ئەویشم کە دەڵێ (ێ)ی کۆتایی رستەی ( پارەکەی داونەتێ) لەوانەیە کورت کراوەی حەرفی جەری (پێ)بێت ، بەلاّم ئەوەی لەگەڵیدا نیم ئەو کە (ت)ی رستەی « رۆیشتومەتە ماڵ» نێو بری پاراستنە بەتەنیا بەڵکو ئەرکێکی تریشی لەسەر شانە ، ئەمەش لە ئەنجامی بەراوورد کردنیدا لەگەڵ رستەی «چیمەسەماڵ»دا دەردەکەوێت . .

– هەردوو رستەش یەك مانایان هەیە – لێرەشدا ئەم سینە ئامرازی پاراستن نی‌یە بەڵکو کورت کراوەی کاری هەبوونی (هەس)ە .

هەر بەم جۆرە بە پێویستی دەزانم کە باسی کاری هەبوون بکەم تا وێنەکە روونا کتر بێت و بەئاسانی ئەو دەنگە بزوێنانەی تایبەتن بە پاراستن لەوانە جیا بکەینەوە کە تایبەتن بە کاری هەبوون ، هەروەکو نووسەرانیش کردوویانە بە خوو کاری بوون (کینونە) بە کاری هەبوون (وجود) تێکەڵ دەکەن و لێکتریان جیانەکەنەوەو بە یەك دارشتەیان دابنێن بۆیە دەڵێم :

کاری بوون ، کە لە ووشەی بوونی سۆرانی‌و بین Biyin ی لوڕی – فەیلی – ئەردەلاّنی‌یەوە هاتووە کارێکی تی‌نەچەری خۆویستە هەروەکو هەموو کارە تی‌نەپەرە خۆویستەکان‌و بێ جیاوازی لە هەموو دیالێکتەکاندا گەردان دەکات ، ئەوەتا کاری رابردوو و رابردووی نزیك و دوور و رانەبردوو و فەرمان‌و ئیلزامی‌و . . . هی‌تری لێ دادەرێژرێت ، هەروەها بەیاریدەی ئەو دەیان کاری ئاوێتە دادەرێژین . .

ئەم کارە کاری تەواوە کە دەڵێین « ئەم ئیشە بوو » یان ناتەواوە وپێویستی بە (خەبەر) هەیە وەکو : دارا بوو بەپیاو .

بەلاّم وا سەرنج دەدرێ کە لێکۆڵەرەوەو زمانەوانان ئەو بزوێنەی کە لە دوای رستەوە دێت کە موسنەدەکەی ناو یان ئاوەڵکار یان ئاوەڵناویان شتی تر بێت‌و کارێکی راستو رەوان (صریح) نەبێت بە کاری (بوون)یان داناوە ، ناشزانم بەڵگەی ئەو رایەیان چی‌یە ؟

خۆ ئەگەر لە دیالێکتە جۆراوجۆرەکاندا چاوێك بەو بزوێنەدا بخشێنین دەبینین کاری بوون نی‌یە بەڵکو رەگ یان کورت کراوەی کاری هەبوونە ، ئەم کاری هەبوونەش چەند رێبازێك دەگرێتە بەر و بەپێی گۆرانی دیالێکتەکان شێوەی دەگۆرێ ، ئەم جیاوازی‌یەشە بووەتە هۆیەکی زۆر بوونی شێوەکانی ئاخاوتن‌و دیالێکتی زمانی کوردیمان ، بۆ روون کردنەوەی ئەمەش تکا لە خوێنەر دەکەم چاوێك بەم خشتانەدا بگێرێت‌و پاشان خۆی بریاری لەمەست بەیان‌بکات :

**وێنەیەکەم : خشتەی ژمارە (١) :**

| | (١) | (٢) | (٣) | (٤) | (٥) |
|---|---|---|---|---|---|
| من– | هام‌لەماڵ – | هامەماڵ = | لەماڵهەم – | لەناڵم = | لەناڵم |
| تۆ – | هایت‌لەماڵ – | هایتەماڵ = | لەماڵ‌هەیت = | لەماڵەیت – | لەماڵیت |
| ئەو – | هالەماڵ = | هاماڵ – | | لەماڵە = | |
| ئێمە | هایم‌لەماڵ = | هایمەماڵ = | لەماڵ‌هایم = | | لەماڵیم |
| ئێوە– | هاین‌لەماڵ – | هاینەماڵ = | لەماڵ‌هاین = | | لەماڵین |
| ئەوان – | هان‌لەماڵ = | هانەماڵ – | لەماڵ‌هەن = | لەماڵەن = | لەماڵن |

**لەم خشتەیەی رابورد دەردەکەوێ کە ئەم کارە پێنج ڕیژەی هەیە ، زووربەیان بەکاردەهێنرێن چ لەو شێوە زمانە دابێت و چ لەوی تر و هەمووشیان یەك مانایان هەیە کە (هەبوونە - وجود) لە زەمانی ئێستادا .**

**تێبینی :**

ڕاناوی لکاوی (م ،یت =ی ، - ،یم -ین ، ین ،ن) ڕاناوی فاعلییەتن لە دیالێکتی فەیلیو هەندێ دیالیکتی لوری . . . هەرچی ڕاناوی مەفعوولیەتە ئەمانەن (م ، مان ، ت ، تان ،ی ،یان)و ئەم ڕاناوانەش لەو دیالێکتانەدا لە مەوقیعی فاعلییەتدا نایەت بە پێچەوانەی سۆرانی ، جۆری یەکەم ڕاناوێکن تایبەت بە کاری تێنەپەڕ و جۆری دووەمیش تایبەتین بە کاری تێپەڕ و لە حاڵەتی مەفعوولییەتو مەجروورییەتدا بەکار دەهێنرێت . . کە لەوێدا ئەمە نی یە . جگە لەمەش لەنێوان ڕاناوی فاعلییەتی جۆری یەکەم لەگەڵ هاوتاکانیان لە سۆرانیدا جیاوازی هەیە ، ئەوەی لە سۆرانی بزانێت لێی بێ ئاگا نی یە .

وێنەی دووەم -خشتەی ژمارە (٢) : .

| فەیلی | لوری | عەرەبی |
|---|---|---|
| من - هەسەم | هیسم | اناموجود |
| تو - هەسەت | هیست | انت موجود |
| ئەو - هەسەی | هیسش | هوموجود |
| ئێمە - هەسەمان | هیسمان -(هیسمو) | نحن‌موجودون |
| ئێوە - هەسەتان | هیستان -(هیستو) | انتم موجودون |
| ئەوان - هەسەیان | هیسشان - (هیشو) | هم موجودون |

**تێبینی(١)**

کار یان ڕاستتر «چاووگ» لەم وێنەیەدا دەدرێتە پاڵ ڕاناوی لکاوی بۆ مەفعوولییەت یان ڕاستتر بۆ ئیزافە هەربەم جۆرش ناو یان ڕاناو ئەم گەردانە دەبین وەکو :

خۆم ،خۆمان ،خۆت ،خوتان ،خۆی ،خۆیان من وای بۆ دەچم کە ئەمە چاووگە و چاووگیش لە زمانی کوردیدا - بەتایبەتی لەم شێوانەدا - سەودای ناوی لەگەڵ دەکرێت .

تێبینی(٢) :

لە شێوە زمانی لوری‌دا لە کاتی درانەپاڵ ڕاناواندا لە نێوان ڕاناوی فاعلییەت و مەفعوولییەتو لە نێوان کاری تێپەڕو تێنەپەڕدا جیاوازی ناکرێت .

تێبینی (٣) :

لە لوریدا نونی پاش ئەلیف لادەبرێ بەڵام کە دەنگێکی بزوێنی نوێ بە ووشەکەوە نووسا بۆی دەگەڕێتەوە ، وەکو :

بیاسی ماڵمو = وەرە بۆ ماڵمان .

ینە ماڵمونە = ئەمە ماڵمانە

دەبا سەیرکەین لە قسەکردندا ئەم دوو وێنەیە چۆن دەبن :

أ - هاتم = هاتمە = هاتمەس = هاتمەسەو = هاتمەسەوە (کاری تێنەپەڕ)

هاتومە = هاتومەتەو = هاتومەتەوە (سۆرانی)

ب - هات = هاتیە . هاتگە ، هاتیەس ، هاتگەس = هاتیەسەو . هاتگەسەو = هاتیەسەوە .هاتگەسەوە . .

=هاتووە . =هاتووتەو = هاتووتەوە (سۆرانی)

هاتیە = هاتیتەوە (شێوەیەکی تری سۆرانی) .

ج - خواردم = خواردمە = خواردمەس = خواردمەسەو = خواردمەسەوە

خواردمەی = خواردمەسەی = خواردمەسەوەی=

=خواردگمە = خواردگمەس = خواردگمەسەو =

خواردگمەسەوە = خواردگمەسەی =

خواردگەسەوەی .

=خواردمە=خواردمەس = خواردمەسی .

**چەند سەرنجێك :**

١ - ئەگەر (س) بۆ پاراستنی بوایە لە دواوەی ووشە نەدەهات وەکو لە خواردمەس و هاتمە

٢ - ئەو (س)بەی دراوەتە پاڵ کاری تێپەڕ لەم شێوەیەدا مەفعووله بەڵام لە کاری تێنەپەڕدا فاعیلە و جاروبار دەبێ بە «گ» .

٣ - (ی) هەندێ جار و (ت)یش هەندێ جاری تر شوێنی (س) دەگرێتەوە کە وا کاری هەبوونە یان چاووگی هەبوونە ، ئەمەش بەڵگەیەکی روونە بۆ ئەوە کە ئەم (ت) و (ی)یە لە

بنەڕەتدا کاری هەبوونن یان ڕەگی ئەو کارانەن یان ڕەگی چاووگەکانیانن . پێشکەوتنی زمانو جیاوازیی ئاخاوتن بەم شێوەیەی گێڕاونو تەنها بۆ پاراستن نین . .

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بابەتە ئاڵۆزەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەو بە دوادا چوونێکی زۆر تر هەیە و ئەوەی پێشانیشم دا تەنیا ئاور دانەوەیەکی سەرپێیە و هیوادارم زمانەوانان بایەخی پێ بدەن .

وا چاکیشە بڵێم ئەگەر لە شێوەزمانەکانی تریشدا پشکنینەوەیەك بکەین . لەوانەیە وێنەی تری کاری هەبوون بدۆزینەوە . وەکو ئەمە بڵێی :

هەی . هی . هێ . هەنی . هەیی . .هتد .

لە بەشی چوارەمی کتێبەکەدا لاپەرە ١٢٥ – ١٢٨ باسی بابەتی بەیەك گەیشتنی نیشانەی کاری رابردووی نزیك (راستتر ئەوەیە بڵێ پاشگر» لەگەڵ ئەو پاشگرەی کە مانای دووبارە کردنەوە دەدا لە یەك رشتەدا .

بەراستی ، زۆر بەچاکی ئەم بابەتەی بە ئەنجامداوەو چەند دەرەنجامێکی بەدەستەوە داوە کە سەبارەت بە چەند لایەنێکەوە نەبێ لاریم لێیان نی یە وەکو ئەمەی کە پێشتر لێی دواین و لایەنی گونجانو نەگونجانی دەنگەکان لە ناو خۆیاندا ولایەنی تایبەت بەلوریو گەردانی کات لە لوریدا بەتایبەتی دەربارەی ئەو (ت) یەی کە بە ئامرازی پاراستنی دادەنێ .

بەلام لەبەشی پێنجەمدا (١٢٨ – ١٣٢)کە بۆ مۆرفیمی (ەوە) و ئامرازی پەیوەندی تەرخان کردووە ، دووبارەی دەکەمەوە کە نیشانەکە (وە)یەو (ەوە)نی یە لەوانەشە لە دوو نیشانە پێك‌هاتبێت کە (و+ە)ن کە هەردووکیان نیشانەی جەرن هەروەکو لە شوێنێکی تردا ئەمەم روون کردەوە ، بۆیەش دەڵێم دوو نیشانەن چونکە بزوێنەکەی دواوە لە توانادادا لە ناو بچێت و بە (و)ەکە بەتەنیا ئیکتیفا بکرێت هەروەکو دەڵێین : (لەماڵەو بووم) لەجیاتی ئەوە بڵێین (لەماڵەوە بووم) من وای بۆ دەچم ئەم بزوێنە بۆ دوویات کردنەوە (تەئکید)ە ونیشانەی راستەقینەش (و)ە بەتەنیاو ئەو بزوێنەشی پێشیکەوتووە ئامرازی پاراستنە .

بەلام کە گوتراوە (وە) لە جیاتی هەندێ پریپۆزیشن دەردەکەوێت بەتایبەتی (بە ،لە)چونکە ئەم ئامرازەنە لە نزیك و نە لە دوور پەیوەندیی بە مۆرفیمی (ەوە) نی یە ، جا ئەگەر ئەم مۆرفیمە تایبەتی بێت بە دووبارەکردنەوە یان بە رابردووی نزیك و هی‌تر (لەمەوبەریش ئامرازمان ناساندو پێویستی بە دووبارە کردنەوە نی یە .) بەڵ گی یەکەمی ئەم ئامرازە شێوەیەکی دەنگی (ب)یە نەك دە ی (ل) ، چونکە کوردی لور (لە) بە (وە) ناگۆڕنەوە ، بەڵکو (بە)بە (وە) دەگۆڕنەوە ئەمەش لە گۆڕینی زوربەی دەنگەکانی (ب) بۆ فۆنیمی (و) روو دەدا وەکو :

باران = واران ، بەرخ = وەرك

بەرەن = وەرەن . . .هتد

بەلام کە دەڵێ (وە شار کەرکوك هاتگە سە دنیا) لام وایێ ئەم واتەیەی بە هەڵە ژنەفتووە چونکە راستەکەی ئەوەیە بڵێ : (لە شار کەرکوك هاتگەسە دنیا) .

هەر بەم جۆرەش لە رستەی (وەمناڵیەوە . .) ئەم (وە)یە بەرامبەری (بە) یە نەوەك (لە) وەکو ئەو بەهەڵە بۆی چووە . لە رستەی (کەفتم وە زیللەت)یشدا (وە) بریتیە لە (بە)و بەرامبەر بە (ب)ی حەرفی جەری عەرەبی‌یە .

لەرستەی (حوسەین وە عەلی)دا (وە) ئامرازی پەیوەستیە بە مانای (لەگەڵ)نایە هەتا ئەگەر کارێك پێشی نەکەوێ وەکو : هات وە گەڵمان ، بیا وەگەل ئازاد .

سەرباری ئەمانەش دەڵێم (وە)بەمانا (بە)ش دێ لە سوێند خواردندا : بەخودا = وەخودا . .

دەربارەی پاشکۆکەشی لەگەڵ مۆرفیمی دووبارەدا (ل ١٣٠ بەولاوە) ئەگەر ئاورێکی لە مەسەلەی گونجان و نەگونجانی دەنگەکانی بدایەوە کارێکی تەواو پوختی پێش‌کەش دەکرد .

## چوارەم

## بنەی دووەم : لە دەستەی شێوەکانی موکریو سۆرانیدا ل ١٣٣ – ١٥٠

ئەو بەشە بە هەر سێ پارچەکانییەوە چ قسەیەکم نی یە دەربارەی ، بەو پێیە هەرچی هەبێ لەو چوارچێوەیە دەرناچێت کە لەمەوپێش باسمان کرد ، بەلام پێویستە بۆ هەق بڵێین ماموستای ئالانی رەنجی داوەو ووردبوەتەوەو لێکۆڵینەوەیەکی باشی کردووەو کۆمەڵە بەڵگەو نموونەیەکی باشی خستوەتە بەردەمی لێکۆڵەرەوان کەگشتیان شایەدی بۆ یەکیەتیی زمانەکەمان دەدەن سەرە رای زۆریی شێوەکانی . ئەم کارەش بۆی هەیە یاریدەی نووسەرانو لێکۆڵەرەوان بدات بۆ گەیشتنە ئەنجامی نوێ و بەکەڵك .

## پێنجەم : بنەی سێیەم : لەدەستەی شێوەی ئەردەلآنیدا

بەر لەوەی بچینە ناو باسەکەوە دەمەوێ بڵێم کە ووشەی (نەوو)ی دێری سێیەمی شیعرەکەی مەردوخ (نەو)ە ئەگەرنا لەگەڵ قافیەی (خەو) رێك ناکەوێت .

هەر چەنم کۆشا کەس خەوەرەو نەو
لە تەنیائیا منیچ چوومە خەو

بۆچوونەکەی مامۆستا (مەردوخ) راستە دەربارەی پاشگری تایبەت بە دووبارەکردنەوە کاتێك کە بە کارو چاووکەوە دەلکێت وەکو کە لە ئەردەلآنیدا دەگوترێ :

هاتەوە ، هاتەو

هەروەها دەش‌گوترێ :

هاتنەوە ، بردنەوە . .

بەلآم ئەوەی کە دەبێ تێبینی بکرێت ئەوەیە کە دوو رێژەکەی یەکەم تایبەتە بە کاری تێنەپەری خۆویست ، بەلآم لە حاڵەتی چاووگدا دەگوترێ :

(هاتنەوە)واتا :

چاوگ +ە+وە

ئەمەش بۆ ئەوەی (نوونی چاووگ) لەگەڵ نوونی بکەر (راناوی بزری کۆ) تێکەڵ نەکرێت هەر ئەم حاڵەتەش بەسەر کاری تێپەرو چاووگەکەیدا جووت دەبێت وەکو دەڵێی :

بردەوە ، بردنەوە

بەلآم ئەگەر کارەکە تێپەڕبوو – نەك چاووگ – ناگوترێ (بردەو)بە مەبەستی دووبارە و دووپات کردنەوە ، چونکە ئەو حاڵەتانە تەعبیر لە مانایەکی نوێ دەکەن کە کارەکە لە ئەنجامی پاشگری (ە+و)دا دەستگیری دەکات ،چونکە کە دەڵێین (کردەو) لەبنەرەتدا بریتی‌بووە لە (واکرد = ئەوکرد =کردەو)

هەروەها : (خستەو = واخست = ئەوخست = خستەو)

ئەوەی سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە هەر سێ جۆرەکە لە هەندێ لقە لەهجەدا بە هەمان مانا بەکاردەهێنرێن . جا ئەگەر مەبەستیان دەربرینی دووبارەکردنەوە بێت دەڵێن : (کردووەوە ، خستەوە) ئەمەش کەم بەکار دەهێنرێت و ئەوەی زۆرتر باوە ئەوەیە کە دەڵێن :

لە نوکردەو (واتا جارێکی ترکردییەوە) = دوبارە – دو وارە کردەو . . .هتد .

بەلآم لە حاڵەتێ کاری لێکدراودا سێ رێژە هەیە و تەنیا یەکێکیان بۆ دووبارە کردنەوەیەو دووانەکەی تر بۆ دووبارە کردنەوە نی‌یە بەڵکو کارێك دەگەیەنێت کە دەخوازرێت لە لەهجەکانی تردا تەعبیری لێ‌بکرێت :

١ – پڕکردن :
٢ – پڕمەوکرد = پڕیەوکردم = (پڕم‌کرد)
٣ – (پڕی کردمەوە = جارێکی‌تر پڕم‌کردەوە ، بۆ
پڕی کردمەو = دووبارەکردنەوە

لە رێژەی یەکەمدا بەرکار ئاشکرا نی‌یە بەڵکوبزرە ، بەلآم لە رێژەی دووەمدا بەرکار بە کەرتی یەکەمی کاری لیکدراوەوە نووساوە . هەروەها لە هەردوو حاڵەتی رێژەی سێیەمیشدا .

ئەگەر بپرسن ئەدی ئەم (واو)ەو پیتە کۆنسەنەنتەی پێشەوەی کە لە رێژەی یەکەم و دووەمدا بە بەرکارەوە نووساوە چی‌یە ؟ لە وەلآمدا دەڵێم ئەمە پریپۆزیشنە ، چونکە لەو لەهجانەو لەهجەگەلی لوری و فەیلی و لقەکانیاندا کاری لێکدراو بە (واسیتە)یەك دەبێ بەتێپەڕ ، دەگوترێ :

دای بە کوشت = دای‌وە کوشت        جعله قتیلا)
دای ئەو کوشت = دایەو کوشت )(جعله قتیلا)

لێرەدا سەرنج دەدەین پریپۆزیشن لە (بە)وە گۆڕا بە (وە)پاشان لە (وە) وە بوو بە (ئەو) ئنجا قوڵەکرایەوە و بوو بە (ەو) ، ئەوەی شایانی باسە هەموو ئەم جۆرە رێژانە بەکاردێن بەلآم لە لقە لەهجەکاندا و هەر یەکە بەجۆرێك . بۆیە کە دەڵێین :

پڕی کردەو = پڕیەوکرد = پڕی ئەوکرد =کردەی (وەپڕ) = (ئەوپڕ) – جعله مملوء – لەم بابەتەوە نموونە زۆرە ، هەروەکو :

هاتەوری = هات وەری = هات‌ئەو ری = وەری‌هات = هات بەری = بەری هات (بەمانا خضع وانسجم) .

وەکو گوتم دووبارەکردنەوە بە پاشگری (و) ناکرێت بەڵکو بە بەکارهێنانی بێژەی‌تر دەکرێت کە دووبارە کردنەوە بگەیەنن ، نموونەش بۆ ئەمە ئەم تاکە دێرە شیعرەیە کە مامۆستا هێناویێتی :

**کەس خەوەرەو نەو**

کەوا (ەو) لێرەدا بۆ دووبارەکردنەوە نی‌یە بەڵکو پریپۆزیشنە چونکە کە دەڵێین (کەس‌وە خەوەر نەو) مەبەستمان (کەس بەخەبەر نەبوو)ە . جا (ەو)ی ئێرە هلگەراوەی (وە)یە دوای ئەوەی بووە بە (ئەو) بۆیە دەتوانین بڵێین (کەس ئەو خەوەر نەو)

بەبێ ئەوەی ماناش تێك بچێت و بۆ کورت کردنەوەش دەگوترێت :

(کەسەو خەوەر نەو) یانۆ (کەس خەوەرەو نەو) هەمووشیان یەك مانان ، خۆ ئەگەر شاعیر مەبەستی دووبارە کردنەوە بووایە دەبوو بلێ : (کەس خەوەرەو نەویەو ) = کەس بەخەبەر نەبوەوە .

تێبینی‌یەکی بچووکیشم هەیە دەمەوێ لەم لاڕێ‌یەدا لە دەستم نەچێت و بیلێم ، مامۆستای ئالانی لە ل ١٥٧ دا نووسیویە ووشەی (لێلە) مانای (لێلاو) دەدات ، راستی‌یەکەی وانی‌یە بەڵکو لێلاو مانای شێلوو و مەیلەوتاریك دەگەیەنێت کەچی (لێلە)مانای پڕشەو بریقەو درەوشانەوە دەگەیەنێت .

× × ×

**شەشەم :**

بەشی چوارەم هەڵدەبوێرم چونکە هیچ تێبینی‌یەکم دەربارەی نی‌یە و دێمە سەر بەشی پێنجەم :

١ – ئەو (ەن)ەی کە لە لەهجەی هەورامی بە پاشەوەی کاری رابردووەوە دەلکێ کەوا لە ١٧٣ وە لە پەراوێزی ژمارە (٨٧) دا باس کراوە رابیتەی رستە ناو نی‌یە ، چونکە هەندێ رستە لە بنەڕەتدا خۆ رستەناو نین هەتا پێویستیان بە (رابیتە) هەبێ ، من لەو باوەڕەدام ئەمە کاری یاریدەرە ، کاری بوون (وجود)ی زەمانی (ئێستا) کە بنچینەکەی بریتی‌یە لە هەن) ، ئەم کارە شێوەی جۆراو جۆری تری لە لەهجەکاندا هەیە وەکو :

هەن ،هەس ، هەیە ،ها .

لەوانەشە ئەگەر لێ‌ی بکۆڵینەوە زۆر شێوەی تریشی بدۆزینەوە وەکو ئەمانە :

ئاوەردهەن ، کەردهەن ، فولادهەن ، شادهەن ،
ئاوەردەن ، کەردەن ، فولادەن ، شادەن . . .

٢ – لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە لە لاپەرە ١٧٥دا دەربارەی (گە)و(ەن) کردوویەتی ، ئەگەرچی پێشتر باسی (گە)مان‌کرد بەڵام جێ‌ی خۆیتی کە بلێم :

(گ) پاشگرە لەو لەهجانەدا ئەگەر هاتە سەر کاری رابردوو دەیکا بە ناوی بکەریان ناوی بەرکار ئەگەر کارەکە (مبنی مجهول) بوو :

هاتگ ، خوریاگ .

بەڵام ئەگەر پاشگری (ە) کەواکاری بوونە لە کاتی ئێستادا هاتە سەر ناوی بکەر یان ناوی بەرکار کە بەم شێوەیە داڕێژرابێت دەیگەڕێنێتەوە حاڵەتی کاری رابردووی نزیك .

زۆر کەس خەیاڵ هەڵی‌دەکرێ‌و بە راناوی نادیار (کەسی سێ‌یەم) ی دادەنێ ئەمەش راست نی‌یە چونکە راناوی کەسی سێ‌یەم لەو لەهجانەدا هەمیشە بزرە ئەگەر کار تێپەڕ بێت یان تێ‌نەپەڕ ، ئەوان دەڵێن : هات ، خوارد کە چی لە لەهجەی سۆرانیدا لەچاو کاری تێ‌نەپەڕدا دەگوترێ (خواردی) .

بەڵام «گ» کە لەگەڵ کاری رانەبردوو لە حاڵەتی کەسی سێ‌یەم دا بێت ئەوا وێنەیەکی (د ،ت)ەو نە پاشگرەو نە راناو وەکو خۆیگ ، چووگ (دەخوات و دەڕوات) کە لە بنچینەدا خۆید ، چوود هەردوو زاراوەکەش بەکار دێن .

**حەوتەم :**

**دەربارەی بەشی شەشەم (لە لوڕی‌و فارسیدا)**

١ – بەر لە هەموو تێبینی‌یەك دەبێ بلێم ئەو (سەرچاوانەی) دانەر پشتی پێ‌بەستوون بێ‌هێزن ، نەخوازەلا (فەرهەنگی لەك ولوڕ) کە یەکێکە لەو سەرچاوانە لە لایەنی فۆنەتیك و ماناوە ئەوەندە هەڵەو چەوتی‌ی تێدایە ئەگەر بمەوێ راستیان بکەمەوە کتێبێکی ئەوەندەی فەرهەنگەکەی تێ دەچێ .

واتە راست کردنەوە کەڵکی نی‌یە ، لەگەڵ ئەوەشدا وەختی خۆی مانای زاراوەیەکی زۆرم راست کردەوە بەڵام نەمتوانی ووتارەکەم بڵاو بکەمەوە .

لە سەر ئەوەشەوە هەندێ دانەی کتێبەکەم راست کردەوەو یەك لەو دانانەم لای برامان دکتۆر مارف خزنەدار داناو لیستەیەکی ٣٠ لاپەڕەیم بۆ ئەو ووشانە رێك خستووە کە لەلایەنی ماناوە ناتەواون ، خۆ ئەگەر لایەنی چەوتی‌ی فۆنەتیکیش چاربکەم ئەوا پێویست بە نووسینەوەی کتێبێکی تەمەت فەرهەنگەکە دەکات و وەکو گوتیشم بژار کردن‌و راست کردنەوە بەکەڵك نایەت .

سەرچاوەی دووەمیش کە دیوانی بابەتایەری هەمەدانی‌ی شاعیرە ئەویش بەدەستی فارسەکان تووشی شێوانو دەستکاری هاتووە و مۆرکی فارسیانەی پێوەدیارەو ئێجکار لە بنەڕەتە

لوڕی‌یەکەی دوور کەوتوەتەوە ، بۆیە پشت بە تاکەکانی زمانەکەی نابەسترێت چونکە بەشێوەیەکی گشتی شێوێنراوە .

هەرچی سەرچاوەکانی تریشە وابزانم لە نووسینەوەیاندا هەڵە رووی داوە ، چونکە ئەو سەردەمەی کە نووسراونەتەوە رێنووسی کوردی بەو شێوەیەی ئێستا پێش نەکەوتبوو جا بەر لەهەموو شتێك با هەڵەکان دەست نیشان بکەین :

(پوقسە = تەقینەوە) مامۆستا ئالانی بەم جۆرەی نووسیوەتەوە بەڵام ئەگەر بگەڕێتەوە سەر بنەرەتی فەرهەنگەکە دەبینێ کە هەڵەی هەڵبژاردووەو راستی بەلاوە ناوە کە نووسراوە :

پوقسە = تەقیوە (نەك تەقینەوە) واتا کاری رابردووی نزیکەو پێکهاتووە لە پوق + سە ، دەشزانین کە (سە) مانا (ئێستا)بەو کارێکی تێنەپەڕی خۆنەویستە (لاإرادی) بەڵام کارە خۆویستە تێنەپەڕەکان لەم لەهجەیەدا (یە)ی پێوە دەلکێ بۆ ئەوەی بیکا بە کاری رابردووی نزیك :

هاتیە = یەتیە . . هوفتەیە = خەوتووە

لەو لەهجەیەدا جیاکردنەوەی ناوی بکەر لە ناوی بەرکار لە لایەکەوەو کاری رابردووی نزیك لە چاو کارە تێپەڕە خۆنەویستەکاندا زەحمەتەو تەنیا بە گۆڕینی دەنگ دەکرێت وەکو :

رمسە = Rimise = رماوە

٢ – لە لاپەڕە ١٨٢ دا دەربارەی رستەی (توام چمەوا ئەرای ماڵ) دەڵێ :

«لەم رستەیە دڵنیا بووم‌و هەر ئەو دیاردەیەیە کە لە فارسیەکەدا دەرکەوت‌و بەڵام لێرەدا ، وەك پاشگر خۆی ساغ دەکاتەوە .

بە دووریشی نازانم کە (چمەوا) دەمی(چمەوە) بێ و لە ئاخاوتنی ئەو هۆزەدا ئاوای بڵێن . .)

بەڵام بە دووری نازانم کە وشەی (چمەوە) (چمەدوا) بێت ، بەڵام دەنگی دالەکە زۆر نزمە بە رادەیەك کە بەرگوێ ناکەوێت .

لە لایەکی تریشەوە لەو بڕوایە دام (ب)ی کاری داخوزی لە پێشەوە پەڕیوە کە بۆ دەقی مانای (دەمەوێ بگەڕێمەوە) دەبێ بنووسرێ (توام بچمەدوا) .

٣ – لە لاپەڕە (١٨٣)دا نووسراوە :

(وا : واز ، وابییە : کردنەوە = بازشدن)

وابییە مانای (کردنەوە)نی‌یە ، بەڵکو دوو مانای هەیە :

ا – یان کارێکی لێکدراوە و بەمانا وازبووە دێت و دەگوترێت درانەگە وابییە = دەرگاکە وازبووە ، واتا دەرگاکە کراوەتەوە .

ب – یان چاوگە و چاوگیش لەم لەهجەیەدا بە (ن) کۆتایی دێت و پیتی پێش نوونەکەش بزوێنە ، هەتا چاوگەکەش بەدەنگە بزوێنێکی ترەوە نەنوسێت نوونەکە لا دەبرێ بەڵام هەرکە دەنگێکی بزوێنی تر هات ئەوا نوونەکە دەگەڕێتەوە . . ئەوسا ماناکەی وای لێ‌دێت :

وابییە = وازبوون = وازکردن = کردنەوە .

هەر بەم جۆرەش (واچووگە) کە ئەویش یان چاوگەو مانای (کولاندن) دەدات نەك (کولانەوە) .یان کارێکی لێکدراوە و بەمانا (کولاوە) دێت و نەك کولانەوە .

٤ – لە برگەی چوارەمدا هاتووە :

وایەك = بەیەکەوە = بایەك

بەگورانی : وە = بە پریپۆزیشنە

بەر هەڵستی ئەوە ناکەم کە (وا) لێرەدا پریپۆزیشی بێت بەڵام لەمانادا لە (بە=وە) جیایە چونکە (با=وا)لەم لەهجەیە ماناگای (لەگەڵ)دەدات ، وەکو دەڵێ‌ی : وایەك = لەگەڵ‌یەك ، نەوەك (بەیەکەوە) .

ووشەی (واکەرە) کە لە دێڕە شیعرێکی بابەتایەردا هاتووە مانای (کردنەوە) نی‌یە بەڵکو مانای (جودابکا)یە .

ئەگەر قەسابەم ئەز تەن (واکەرە) پوست جودا هەرگز نەکەردە جوونەم ئەز دۆست .

لەم چەند سەرنجانەی پێشەوەدا دەردەکەوێ کە دانەر بەشێوەیەکی راست لەم لەهجەیەدا دەست نیشانی نیشانەی دووبارە کردنەوەی نەکردووە مەگەر ئەوەندەی‌کە لەیەکەم بەشی دواوەی لاپەڕە ١٨٣ لە ووشەی (شادبییەوە)دا بەڵام نموونەکانی تری هەمووی لە مەبەست بەدوورن .

لە بەشی‌سی‌یەمدا ، بە پێویستی دەزانم کە هەندێ هەڵەی رێنووسی لە نموونەکاندا هەیە دەست نیشانی بکەم :

١ – درەختی ، دەرگاهی ، راستییەکەی (درەخت ، دەرگاه) لەگەڵ زێرێکی کورت‌دا ، چونکە ئەو لەهجەیە (ی)ی سەربار (إضافة) لەو ووشانەدا بەکارناهێنێ کە

بەدەنگێکی کۆنسەنەنت دواییان هاتبێت ، بەڵکو تەنیا لەگەڵ ئەو ووشانەدا بەکاردێت کە بە پیتە بزوێن دواییان هاتبێت وەکو : ماڵەگەی ئازاد ، خانای قوبادی

٢ – (بەیزایی نیم بەیاز) راستی‌یەکەی (بەیزای نیم بەیاز) چونکە کێشەکەی لەنگ دەبێت‌و لەلایەکی تریشەوە چونکە (ی)ی سەربار کەوتوەتە دوای پیتە بزوێنێکەوە کە خۆی کۆنسەنەنتە ، لە هەمان دێڕیشدا ووشەی (کردەش) هەڵەیە چونکە بەم شێوەیە مانای (معمول) دەدات واتا (کردە) ناوی بەرکارە لەو لەهجەیەدا وابزانم لە سۆرانیشدا ئەمە هەر هەیە ، ئەوەتانێ لور دەڵێن : کردەی من‌و خواردە بێگانە . .

کەوابێ راستی‌یەکەی (کەردش)ە واتا کردی .

ووشەی (کوتەگە) هەڵەیە وراستی‌یەکەی (کەوتگە) . لە دێڕی دووەمیشدا (زحاف) هەیە کە چار ناکرێت هەتا (کە) لانەبرێت یان (مەگە) لە (ئەم) نەدرێت تا بیێ بە مەگەم حاڵەتی یەکەم باشترە .

لە دێڕی چوارەمیشدا (خبن) هەیە ، راست نابێتەوە مەگەر بنووسین (جیش = جی‌یش) . ئەمەو دانانی نیشانەی (٧) لەسەر (ی) لە (جی) و لەسەر (و) لە (شورەزەمینە) هەڵەیە چونکە لەم لەهجەیەدا ئەو دوو دەنگە دەگمەنن‌و چەند حاڵەتێکی تایبەتییان هەیە .

٤ – دانانی نیشانەی (٧) لەسەر پیتی (ی)ی ووشەی (لەیێ) هەڵەیەو دژی فۆنەتیکە چونکە دوو دەنگی بزوێن بەیەکەوە کۆنا کرێنەوە .

**هەشتەم :**

دەربارەی (بنەی حەوتەم – لەکرمانجی سەروودا) دوای ئەوەی بە دوورودرێژی لێکۆڵینەوەو وتووێژی بە ئەنجامداوە رەنجێکی باشی بەخت کردووە ، بەڵام ئەوەی سەرنجی راکێشام ئەوەیە کە دەڵێ :

(کاری «مەکەڤە» دەق گەردانی «مەکەوە»یەو پاشگر نیەو بزوێنەکەشی راناوەو سەر بە کارە داخوازیەکەیە) .

بریاردەدا کە بزوێن لە (مەکەوە = مەکەڤە) راناوێکەو بۆ کاری داخوازی دەگەرێتەوەو ئەمەش مانای وایە بکەری کارەکەیە . لاموابێ راستی نەپێکاوە و وابزانم ئەمە (نیشانە)ی داخوازی‌ی ئەمریەتەو راناوی بکەرنی‌یە ، چونکە ئەگەر راناو بوایە نەمان دەتوانی لایبەرین کە بەلابردنی مانا دەگۆرێت هەر لەبەر ئەمەشە زۆر لەهجەی کوردی لە دواوەی کارەکەی دادەنێت ، تەنانەت لە لەهجەی باویشدا ئەم نیشانەیە لە هەندێ کار نابینین وەکو ئەوە کە دەگوترێ : برۆ ، بچۆ . لەهجەیەلی ئەردەلانی ، لور ، فەیلی ، لەکو ژمارەیەکی تریش گوێ بەو دەنگە کونسەنەنتە نادەن‌و دەگوترێ : بنیش ، دانیش ، بخەف ، هەڵس . . تاد .

سەرباری ئەمەش ئەوەی ئەمری پێ‌ کراوەو کارەکە بەجێ دەگەیەنێ هەیە بۆیە پێویست بە پەنادانی راناو ناکرێت کە دەست بۆ ئەو هەڵبرێ ، هەروەکو بڵێی لەزمانەکە دوور دەکەوینەوە ئەگەر بڵێین راناوەکە نادیارەو بە (تۆ) مانا لێ دەدرێتەوەو تەقدیر دەکرێت ، چونکە تۆیەکە هەیەو گوێ‌دێری فەرمانەکەیە بەچاکو بە خراپ ، ئیتر چ هۆیەکیان بە راناو دەکەوێ بە پەنادراوی‌و بە نادیاری . کاری داخوازی روو دەکاتە کەسی دووەم ، نی‌ی نە لە عەرەبی‌و نە لە ئینگلیزی‌و زۆر زمانی‌تریش‌دا راناوێکی لکاوی پێوە نابینین . لەگەڵ ئەوەشدا پی‌ی‌لێ داناگرم‌و دەڵێم لەوانەیە ، بەڵکو زمانەکەمان لەم بارەوە دەگمەن بێت ! ؟

**نۆیەم :**

لە بەشی کۆتایی کتێبەکەدا دانەر باسی ئەرکەکانی مۆرفیم دەکات بە هەموو حاڵەتەکانی‌یەوە و رای نووسەران لەم بارەیەوە پیشان‌دەدات‌و بەشێوەیەکی چاك باسەکە بەئەنجام‌دەدا .

**دوا ووتەمان :**

لەگەڵ ئەو رەخنەو جیاوازیانەی رای من‌و دانەری بەرێزدا کە تائێستا لی‌ی دوام ، بەدڵنیایی‌یەوە کۆششی فرەو رەنجی سەختی مامۆستا ئالانی هەڵدەسەنگێنم‌و لەو باوەرەدام کە باسێکی قەشەنگەو شایانی ئەوەیە نووسەران‌و زمانەوانان بایەخی پی‌بدەن بەتایبەتی زۆرشتی نوێ‌ی وای‌تێدایە کە پێویستی بە وتووێژا ورادەربرینی زانستانەی زیاتر هەیەو لەوانەیە دوای لێکۆڵینەوەو رەخنەی زیاتر نرخی باشتر دەربکەوێت . پوختەی رایەکانی منیش بریتی‌یە لەوە کە هەرچی لە کتێبەکەدا هاتووە گەواهی یەکێتی‌ی زمانی کوردی خۆمان دووپات دەکەنەوە ئەوە دەسەلمێنن کە سەرەرای جیاوازیی بەدیمەن وزۆریی لەهجەکان ، زمانی کوردی یەکەو ئەو کۆششانەش کە لە پێناوی دەرچوون لەو گێژەنە گەورەیەی لەهجە زۆرییەدا بۆ لەهجەی ئەدەبی‌ی یەکگرتوو بدرێت کارێکی بەجی‌یەو بەرداره ئەگەر باسەکان بەو پشوو درێژی‌و مشەمەری‌یە بنووسرێت . خوا مامۆستا ئالانی سەرکەوتووکات‌و رەنج‌و کۆششەکەی بەردار بێت .

# کۆمەڵێک لە داستانی زەبەندو پچڕی رۆشنبیری کوردی‌دا

غفور میرزا کرم

**لە کاروانی نەسرەوتی بێ پشووی رۆشنبیری کوردی‌دا ، لەناو جەرگەی زۆرانبازیی سەختی نێوان کۆن‌و تازەو دواکەوتن و پێشکەوتن‌دا ، لە دەریای ئەندیشەی بیرکردنەوەو زیرەکی و کەودەنی‌دا ، لە هەر پلەو قۆناغێکی تایبەتی‌ی دیاری‌کراودا ، لە هەموو وەرچەرخانێکی مێژوویی گرنگ‌دا ، لە هەموو بوارێکی تیژڕەوی گۆڕانکاری‌دا ، چەند شۆڕەسوارێکی لی‌وەشاوە ، چەند ئەستێرەیەکی پڕشنگدار ، چەند هەڵۆیەکی بێ‌پەروا ، چەند مەلەوانێکی شارەزا رێچکەی سەرکەوتن دەشکێنن ، دەست لە مل هیوای زاڵبوون دەکەن ، نیشانەی بەرزی دەپێکن ، گرەوی نەمری و نەبەزین دەبەنەوە ، لە دواییشدا ناویان لە لاپەڕەی مێژوودا بە مەزنی تۆمار دەکرێ و دەبنە نموونەی دڵسۆزی و مێرخاسی و قوربانی‌دەر بۆ نەوەی دوارۆژ و ناویان لە جووڵانەوەی رۆشنبیری کوردی‌دا بە شانازییەوە دەبرێ و بۆ گەل و نیشتمانەکەمان دەبنە مایەی سەربەرزی و جێگای رووسووری .**

لای هەمووان روونە کە ئەرشیفی رۆشنبیریی کوردی پێویستی‌یەکی تەواوی بە رێکخستن و دەوڵەمەندکردن و رازاندنەوە هەیە کە ئەنجام‌دانی ئەم خۆزگەیەش دەکەوێتە ئەستۆی تێکڕا رۆشنبیرانی کورد وە بە تەقەلای پوخت و کۆششی خەستی سەرجەم خوێندەوارانی کورد دێتە بەردان و بڕشتی چاك . بە ڕاستی پڕکردنەوەی کەندەڵانی گەورەی دواکەوتنمان و تۆڵەسەندن لە رابردووی کەموکووڕی و کەمتەرخەمیمان ، هەڵمەتێکی شێرانەو باوەڕێکی بەتین‌و گوڕوگوڕمێکی بێ هەوتای گەرەکە ..

پێویستمان بە لێکۆڵینەوەیەکی چڕو پیاچوونەوەیەکی تازەو هەڵسەنگاندن و بایەخ‌دانێکی نوێ هەیە تا جووڵانەوەی رۆشنبیریی کورد لە رەوتی پێشکەوتنی خۆی نەکەوێ و رێبازی سروشتی‌ی خۆی بۆ خزمەت‌کردنی گەل هەرگیز بەرنەدات ، مجا بۆ ئەم مەبەستە هەر جارەی بە پێی توانا و بە یاریدەی هەموو لایەك بە رەچەڵەك و ژیان و بەسەرهات و بەرهەمی یەکێك لە رۆشنبیران‌دا دێین ، وە لە دەوری بۆ پێشبخستنی کاروانی رۆشنبیری و خزمەت‌کردنی گەلدا بکۆڵینەوە ، هیواداریـن کە رۆشنبیرانی کورد بەشداری و هاوکاریمان لەگەڵدا بکەن ، هەڵەو چەوتیمان و کەموکووڕیمان بۆ راست‌بکەنەوە ، تا ئامۆژگاریی بەکەڵك و رەخنەی بەسوودی خۆیان پێشکەش‌بکەن . . تا باسەکەمان دەوڵەمەنترو قووڵترو ، شارەزایی زانینمان بە بڕشت‌ترو

فراوانترو جوانتر بێ . . تا بە یاریدەی گشت لایەك کۆشکی ڕۆشنبیریی کورد بەرەو لووتکەی بەرز بەرین و بازاڕی جوولأنەوەی گەرمترو خۆشتر بکەین ، تا شانبەشانی جوولأنەوەی ڕۆشنبیرانی جیهانی لە پێناوی خزمەتکردنی مرۆڤدا هەنگاوی گەورە بۆ پێشەوە بنێین . هەرچەندە کلاورۆژنەی باسەکەمان بە بەڕێز مارف جیاووك دەکەینەوە . بەلأم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە باری گران و پایەی یەکەمین شاسواری ئەم مەیدانە بخەینە ئەستۆی ناوبراو .

بە ڕاستی ئەوەی پێویستە بگوترێ هەوێنی پێشخستن و دەرگا کردنەوەی ئەم باسە تەنیا ڕێکەوت و بوونی سەرچاوەی لەبەر دەستدا بوودا بووەو بەس ، دەنا دەستکردن بە باسی ئەم ڕۆشنبیرە لە پێش ئەوی تردا هیچ لە ئەرك و ناوەرۆکی پرۆژەکەمان ناگۆڕێت . چونکە ئەرکی هەڵسەنگاندنی هەموو ڕۆشنبیرێك و پێشخستنی ئەم و پلە و پایەی ئەو لە خانەی ڕۆشنبیراندا بڕیاری دوایی بۆ تێکرا ڕۆشنبیرانی کوردو بۆ بیرو ڕای گشتیی خوێندەواران دەگەڕێتەوە .

## (٢)
## مارف جیاووك

بەڕێز مارف جیاووك لە بنەچەدا بۆ بنەماڵەی جیاووکی سەر بە هۆزی باڵەك دەگەڕێتەوە ، ئەم بنەماڵەیەی کە لە دێرینەوە لە دەوروبەری گەلی عەلیبەگ نزیك ڕەواندوز شاری خنجیلانەو پایەتەختی میرنشینی سۆران . . هەواریان خستووەو جێنشین بوون و بە کشتوکاڵ و مەڕومالأت بەخێوکردنەوە خەریك بوون . بەم چەشنە هەڵکەوتنی مارف لە ناو ئەم بنەماڵەیەداو دەوری باڵأو بەرزی لە جوولأنەوەی ڕوشنبیری و لە خزمەتکردنی خاك و نەتەوەدا بە یەکجاری ناونیشانی ئەم بنەماڵەیەی بە نەمری و مەزنی لە کۆمەڵگەی کوردیدا هێشتەوەو جێگیر کرد .

باوکی مارف علی ئەسغەر ئەفەندی ناوی بە یەکێك لە داناو زانایانی ئایینیی ناوچەکەدا دەرکردبوو بۆیە دەوڵەتی عوسمانی پایەی ئیمام تابۆری لە لەشکردا پێدا . . ئەوەندەش پایەو پلەی باپیرەشی ( ابو المغازی حاجی مولود سعدی بدیع الزمان ) لە کۆمەڵدا لە مەیدانی ئایینی پەروەریدا بەرزو بڵند بوو و یەکێك بوو لە زاناکانی ئایینی لە کوردستانداو هاوشانی زەهاوی ، ئالووسی ، لە قەڵەم دەدرا .

دوو جاریش بە ناوی غەزاوە بە هاواری دەوڵەتی عوسمانی سەرکردەی کۆمەلأنی خەڵکی لە کوردستانەوە بۆ شەڕی ڕوسیای قەیسەری بووە ، کە لە ئەنجامدا ناوی لە ناوچەکەدا بەرز بوەتەوە ، ئەمە چەند زانین و ڕوونکردنەوەیەك بوو لەسەر بنچینەی باوو باپیری مارف جیاووك .

هەروەکو لەڕووی دایکیشییەوە ڕەگی دەچێتەوە سەر بابانەکان ، بەم چەشنە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی هەردوو بنەماڵەی کورددا مارف لە ١٨٨٥ لەشاری بەغدا چاوی بە دنیای پڕکێشەو چەرمەرسەری هەڵهێنا .

مارف هەر لە منداڵییەوە تروسکەی زیرەکی و وریایی لە مێشك و دڵیدا پریشکی دەدایەوەو گوڕوگوژمی بۆ فێربوون ، خزمەتکردن لە تێکرا هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیدا بەروونی بەدیدەکرا . جا دارایی بنەماڵەکەی دەرفەتێکی گونجاوی بۆ فێربوون و چوونە قوتابخانە بۆ ڕەخساند بۆیە پاش ئەوەی قوتابخانەی ناوەندی لەبەغدا تەواوکرد و بۆ خوێندنی کۆلیجی حقوق بۆ ئەستەمبۆل کەوتە ڕێ . ئەستەمبۆل لەو کاتەدا مەڵبەندی هۆشیاریو کانگای تیشکدانەوەی بیروڕای شۆڕشی فەرەنسە ، سەرهەڵدانی کۆمەڵەی (ئیتتیحادو تەرەقی) بوو ، بۆیە مارفیش تینوویتی خۆی بۆ ئازادیو سەربەستی لەم سەرچاوەی ڕووناکبیرییە شکاندو گیانی کوردایەتیو ئازادی بە بیرو باوەڕی نوێ زاخاودایەوە ، لەم کاتەداو پاش شۆڕشی ١٩٠٨ ی عوسمانی چووە ناو کۆمەڵەی «ئەحرار»ەوە کە (صباح الدين) سەرۆکی بوو دەستیکرد بە چالاکی نواندن و نووسین لە ڕۆژنامەکانی ئەستەمبول . . دڵ ومێشکی خوێندەوارانی دەهەژاند ، خۆزگە هەندێك لەم ڕۆژنامانەمان دەکەوتە بەر چنگ تا بمان توانیایە بە دروستی دەوری مارف لەم بوارەدا هەڵسەنگێنینو پێشانی بدەین . . کە دووبارە ئەم ئەرکەش هەر دەکەوێتە سەر ئەستۆی ڕۆشنبیرانی کورد . . چ ئەمرۆ بێ یان سبەینێ بێ . دیارە مارف لە ڕۆژانی دەستەلأتداریی کۆمەڵەی (ئیتتیحادو تەرەقی)دا زیاد لە پێویست چالاکی دەنواند بۆیە بە لاچوونی ئەم داروەدەستەیەو بە هاتنی دەسەلأتداریی نوێ بڕیاری گرتنی دەرچوو ، کە لە ئەنجامدا ناوبراو تا ماوەیەك تا بەخشندەیی گشتی بۆ تاوانباران دەرچوو هەر بە خۆشاراوەیی مایەوە .

پێش بەرپابوونی شەڕی سەفەربەگلك ، ئاگری جەرگی بۆ نیشتمانیو ، خۆشەویستیی بۆ گەل ناوبراوی بەرەوپیری وولأت

– بۆ بەغدا – خستە ڕێ ، جا لەبەر ئەوەی کە ناوبراو هەستی ڕۆشنبیری‌و شەیدای نووسین و بلاوکردنەوە بوو بۆیە دەستوبرد کەوتە دەرکردنی ڕۆژنامەیەك بە ناوی (حقوق)ەوە بە زمانی عەرەبی کە لەو کاتەدا بلاوکردنەوە لە بەغدا تەنیا بە زمانی تورکی بوو ، لەم بوارەش دا مەگەر هەر خۆزگە خواردنمان لە دەست بێت‌و بڵێین خۆزگە بمان زانیایە ئەم ڕۆژنامەیە چی تێدا دەنووسرا ؟

پاش مانەوەی ماوەیەك لە بەغدا بوو بە بەڕێوەبەر لە قوتابخانەی مامۆستایان لە بەصرەداو کاتێ شەڕ بەرپابوو ، ناوبراو وەك ووتاربێژێك (خطیب) کۆمەلانی خەڵکی ڕاپێچ دەکرد دژ بە ئینگلیزی داگیرکەر ، تەنانەت دەورێکی بالای نواند لە پێکەوەنانی کۆمەڵێ بە ناوی کۆمەڵی (جمعیة الخطابة والدفاع) ئەم کۆمەڵەیە چ لە بارەگاکەیدا یان لەناو کۆمەلانی خەڵکیدا بە ووتاری ئاگرین لە کۆبوونەوەی جەماوەری پەردەی لە ڕووی چڵکنی ئینگلیزی داگیرکەر لادەداو جاری دەرکردنی دەدا لەوولاتدا . تا لەئەنجامدا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بە دیل‌گیراو پێنج ساڵی ڕەبەق بە دیلی لەدیل‌خانەی بورما مایەوە ، کە پاش بەربوونی بۆ بەغدا گەڕایەوە ، لەساڵی ١٩٢٣ لەبەغدا وەکو پارێزەرێکی سەرکەوتوو و قانونناسێکی لێ‌هاتوو ناوی دەرکرد وە لەدواییدا بەوێنەی حاکمێکی لێ‌وەشاوە لەکەرکووك ، هەولێر ، دیوانییە ، موصل . . هتد بە دروستی دادگای بەڕێوە دەبرد . . وە ناوی بە قانونپەروەرو دادپەروەر لەناو کۆمەلانی خەڵکیدا دەرکرد ، لەساڵی ١٩٢٨ دا بوو بەنوێنەری هەولێر لەئەنجومەنی نوێنەراندا کە هەمیشە لەئەنجومەندا دەوری بەربەرەکانی دژی میری ئەو سەردەمە بەرگری‌کردن لەبەرژەوەندی وولات‌و ماف پێ‌شێل‌کراوی کورد دەگێڕا ، لە ئەغستۆسی ١٩٤٤ پاش ئەوەی گزنگی سەرکەوتنی بەرەی گەلان بەسەر داروودەستەی هیتلەردا لەئاسۆی دوارۆژدا بەدی‌دەکرا ، دەزگای میری ئەو سەردەم بۆ خەفەکردنی دەنگی بەربەرەکانی کردنی ناوبراو وە بۆ دڵنەوایی کۆمەلانی خەڵکی کوردستان . . کردیان بە پارێزگاری سلێمانی کە لەدواییدا وازی‌هێناو بە پارێزەری‌یەوە خەریك‌بوو و گوزەرانی بەم شێوە ڕەوایە دابین‌دەکرد .

دەوری مارف جیاووك‌و خزمەت‌کردنی لەمەیدانەکانی ڕۆشنبیری کوردیدا چ بە کتێب دەرکردن‌بێ لەسەر مێژوو و کەلەپووری کوردی یان بە نووسین بێ لەسەر داوای ڕەوای‌و مافی پێ‌شێل‌کراوی کورد لەڕۆژنامەکاندا ، یان بە ووتاردان و کۆڕو کۆمەڵ‌گرتن بێ ، یا بەقسەو یادداشت پێشکەش‌کردن بێ لەسەر داخوازی‌یەکانی کورد لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقی‌دا ، یان لە داکۆکی کردن بێ لەسەر خاك‌و نەتەوەو بە گژداچوون بێ لەگەڵ دەزگای میری ئەو سەردەم‌و داروودەستەی ئینگلیز . . تێکڕا ئەم چالاکییانە لەڕەوتی جوولانەوەی ڕۆشنبیری کوردیدا بە زەقی و ڕوونی دەبینرێ‌و دێتە پێش‌چاو .

مارف جیاووك لەڕەوتی جوولانەوەی ڕۆشنبیری کوردیدا بە یەکێکی ناودارو دامەزرێنەری یانەی سەرکەوتنی ساڵی ١٩٣٠ لەقەڵەم دەدرێ . زووربەی چالاکییەکانی‌و تەقەلای خەستی‌و بەبڕشتی لە مەیدانی ڕۆشنبیری‌دا لەناو ئەم دەزگایەدا ڕەنگ دەداتەوە ، بەڕێوەبردنی یانە بۆ ماوەی زیاتر لەبیست ساڵ‌و بڕینی نازناوی (باوەڕپێکراوی گشتی) بە بالایدا نیشانەیەکی لەبەرچاوو خەلاتێکی گرانبەهایە کە نەمری‌و پیرۆزی‌و ڕووسووری بە جیاووکی ڕۆشنبیر دەدا .

جیاووك لەبەرەی ڕۆشنبیری کوردی‌دا بە چالاکی نواندنێکی بێ‌وێنە لەمەیدانی ڕۆشنبیری‌و بە دڵسۆزێکی بێ‌هاوتا . . بۆ گەل‌و نیشتمان ، بە داکۆکی کەرێکی بێ‌پەروا لەسەر داخوازی ومافی پێ‌شێل‌کراوی کوردو دژایەتی‌نواندن بەرامبەر میری ئەو سەردەم‌و داروودەستەی ئینگلیز ناوبانگی دەرکردووەو ناسراوە . ئیتر هەر ئەم بڕشت‌و جوانی بێ‌گەردی‌یەیە کە جیاووکی لەدڵ‌و دەروونی کۆمەلانی خەڵکی کوردستاندا بە نەمری هێشتووەتەوە جێگای تایبەتی‌و شوێنی دیاری‌کراوی لەناو جوولانەوەی ڕۆشنبیریدا پێ‌داوە .

سەرچاوەکان

کەلکم لە کتێبەکانی مامۆستا مارف جیاووك بەگشتی وە لە گشتی تاریخ مشاهیر الألوية العراقیەی عبد المجید فهمی حسن ١٩٤٦ وەرگرتووە بەتایبەتی .

# هەڵوێستەکانی "شراة" بەرامبەر بە ئیمامەت ئەم رایەیان بۆ هەبوو؟

مصلح جەلالی

مەبەستیش لێرەدا پەرش‌و بلاوکردنەوەی سووپای عیراقە کە بەم پەرش‌و بلاوبوونەوەیە کارەکە بەلایەکدا ئەکەوت ، علی بەم کەڵەکەی زانی‌و سەرەتا داوای لە سەربازەکانی کرد کە بەم کەڵەکە باوەر نەکەن ، کەچی دوایی وازی هێناو شوێن خواستی کۆمەڵی قورئان خوێنەکان کەوت‌و (ئەم کۆمەڵەش ئەوانەبوون کە لەوەو دوا بوونە سەردارانی (شراة) ناوبژی کردنی دوژمنی پەسەند کردو واشیان لی‌کرد بەرامبەر بە عمروی کوڕی عاص کەقسەکەری معاویەبوو ناچار بێ ئەبی موسای ئەشعەری بە قسەکەری خۆی هەڵبژێرێ ، ئەنجامی ئەم کەڵەکەی عمروی کوڕی عاص ئەوەبوو علی لە خەلافەت خزاو معاویە بەخەلیفە دانرا ، (شراة)ەکان ئەم ئەنجامی خەلافەتەیان زۆر لاناخۆش بوو کە کەوتە دەست معاویە ، ئەم هەواڵەش بەرگری‌یە لە هەڵوێستی علی‌و بە پاڵەوانێکی درامی‌ی پەشیمان بووەوەی ئەوتۆی داناوە کە کەوتۆتە ژێر زەبری ئەو لایەنگیرانەیەوە کە ناچاریان کرد (تحکیم) پەسەندبکات ، ئەمانە دوایی هاتن داوایان لە علی کرد کە پەشیمان بێتەوە . . ئەم لایەنگیرانەشی بە (شراة) ناسراون ، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە ئەشعەث کە سەرکردەی یەمەنی‌یەکان بوو ، یەمەنی‌یەکان داوایان لی‌کرد ئەگەر بێتو (تحکیم) پەسەند نەکات ئەوا ئەیگرن‌و ئەیدەنە دەست دوژمنەکەی[1] .

سەرچاوەکانی (شراة) کە تارادەیەك (زۆرکۆن‌نین)[2] سەرزەنشتی علی ئەکەن‌و بەوە تاوانباری ئەکەن کەبەرامبەر بەو زەبرەی کە ئەشعەث لی‌ی کردووە بێ دەسەڵات بووە ، بەرهەڵستکاری (شراة)ەکان ئەوە دەرئەخات کە علی بەوە قایل‌بووە ئادەمیزاد چارەنوسی مافێك لە مافەکانی بدات‌و ئەمەش گومان کردنە لە ئیمامەتی راستی خۆی ، لەبەر ئەوە لەم بارەدا (شراة)ەکان ناچاربوون کە ئیمامێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن‌و هاتن (وهب کوڕی عبد اللەی راسبی) یان هەڵبژاردو پیاوێك بوو

ئەو ناکۆکی‌یەی لە نێوان علی‌و معاویەدا هەبوو گەورەبوو ساڵی ٣٧ی کۆچی شەڕ لە نێوان لایەنگیرانی ئەم دوانەدا لە صفین بەرپابوو ، کەشەر گەرم بوو سوپای عیراق‌و شام تێکەڵ بوون ، سەرکەوتن لای عیراقی‌یەکان بوو لەوانەبوو کە بە تەواوی سەرکەون ، بەڵام ئەو کەڵەکەی عمروی کوڕی عاص درووستی کردوو بە دڵی معاویە بوو ئەوە بوو فرمانی دا قورئان بکەن بە نووکی رمەکانیانەوە و بەو دیاردەیەی کە کتێبی خوا ئەبێ بێتە ناوبژیکار .

ناوبانگی بە نوێژەکەرو خوا پەرست دەرکردبوو . ئەم ئیمام هەڵبژاردنەش ئەو دەمە هاتە پێشێ کە هاتن داوایان لە علی کرد لە مەسەلەی (تحکیم) پەشیمان بێتەوەو تۆبە بکاتو علی نەیویست تۆبە بکاتو پەشیمان بێتەوە ، مێژوونووسان سەبارەت بە (شراة)[3] ئەوانەی وتویانە علی تۆبەی کرد بەڵام لەبەر ئەشعەت نەیتوانیوەو بێدەسەڵات بووە هەندێ لێکۆڵینەوە هەیە ئەڵێن :

ئەشعەتو خەڵکی شام ئەیانەویست سوپاکەی علی پەرش‌و بڵاو بێتەوەو دوری خەنەوە لە چاکترین لایەنگیرانی . هەموو بۆچوونەکان لەوەدا یەکدگیر ئەبنەوە کە (شراة)ەکان تا علی مەسەلەی (تحکیم)ی پەسەند نەکردبوو لەگەڵیا بوونو ناوانیان نیەو تاوانەکەهەمووی لە ئەستۆی علی خۆیدابووە .

بەڵام سەیر ئەوەیە هەندێ سەرچاوە کە سەر بە (شراة)ە کان نین وەك شیعە – تەنیا ئەو دەقانە ئەزانن کە دوورن لە بۆچوونی (شراة)ەکان خۆیانەوە ، جالەم رووەوە ، نوبەختی ئەڵێ : (شراة)ەکان) دوای ئەوەی کە مەسەلەی (تحکیم)لەلایەن هەردوو لاوە تەواوبوو بەرهەڵستی علی‌یان کرد (ئەمەش لەبەر ئەوەبوو لەبەر ئەوەی پەسند کردنی (تحکیم)رای جەماوەرو خەڵکی شام بوو ئەمانەپشت‌گوێ خرانو کەمتەرخەمیان بەرامبەرکرا .[4]

ئیبن طباطبائی‌و[5] ئیبن رازی وەك بۆی چوونو ئەڵێن : (شراة)ەکان کەدیتیان علی (تحکیم)ی پەسند کرد وتیان ئیتر هیچ مافێکی بەسەر ئیمامەتەوە[6] نەما . مبردیش[7] بەلایەوە وایە ئەو مێژوو نووسانەی کە وتویانە (شراة) دوای ئەوەی کە (تحکیم)یان پەسد نەکردو تۆبەیان کرد ئەمە شتێکی راستە .

راستی‌یەکەشی ئەوەیە[8] ئەو جیاوازیانەی لە گێڕراوەکاندا هەین ئەوە بەدەستەوە نادەن کە مەسەلەی (تحکیم) خەیاڵێکی مێژووی بێ بەڵام ئەوەندە دەربارەی گێڕراوەتەوە رایەڵەکانیان ئاڵۆزو پەشێواو بوون . جا ئەگەر بێتو بەراستی‌و هۆشدارانە ئەو گێڕراوانە شی‌و ورد بکرێنەوە تارادەیەك ئەو ئاڵۆزی‌یە چاك ئەبێتو راستی دەرئەکەوێ .

یەکێك لە وراستیانەش ئەوەیە ئەڵێ هەر وەك عیراقی‌یەکان ئەیانوت لە کوشتاری شەری (صفین)دا شەرەکە تاسەر لە قازانجی عیراقی‌یەکان بوو درۆ بوو . چونکە دیارە ئەگەر سوپای شام رێك‌وپێك‌و دەستی توند بە مەسەلەکەیەوە گرتبێ‌و لێ دوور نەکەوتبێتەوە بەسەر سوپای عیراقدا دەستیان رۆشتووە ، خەڵکی عیراقیش وەنەبێ لایەنی سەرکەوتنی علی‌یان گرتبێ‌و جۆشیان بەرامبەر مەسەلەکەی نەبوو ، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو

ئەوانەی کەلەسوپاکەی علی‌دا بوون ئەوانەبوون کە لە شەری (جمل)دا[9] دژی علی جەنگاونو دوای کوشتنی طلحەو زبیر بە ناچاری هاتوونە تەلای علی‌و بەشی زۆریشیان بەمرەبی بوون ، کوفەیی‌یەکانیش بەهۆی ئەوشتانەوە کە لە جەنگی (جمل)دا تووشیان هاتبوو حەزیان لە شەر نەئەکرد .

جا کاتێك کە عمروی کوری عاص هات هانی سەربازەکانی داو داوای سەرکەوتنی کرد وتی : (خەڵکی عیراق بڵاوەیان لێ‌کرد ، ئەو سامەی کە هەیانبوو نەما ، ئەو یەکێتی‌یەشی کەتیایاندا بوو بەسەر چوو ، خەڵکی بەصرەش لەگەڵ علی‌دانین چونکە زوری لێ‌کوشتنو ئازاری زۆردان) . وەنەبێ ئەم شتانەی نەزانیبێ . . لەجەنگی (جمل)دا پاڵەوانەکانی بەصرەو کوفە دژی یەك راوەستان واتە (سوپای علی بێجگە لەم شتانە لەو کەسانەشی تیابوو کە سەر بە عثمان بوونو بەدڵو بەگیان شەریان بۆ علی نەئەکرد . . سەرباری ئەمانەش سوپاکەی علی هەروەك چۆن دڵسۆزو خاوەنی بیروڕای علی تێدا هەبوو هەرواش کەڵەك بازو دوورووشیان تیابوو)[10]

بەڵام سوپای شام وەك رێك‌وپێك بوو لایەنگیری معاویە بوون بەو باوەرەوە کە ئەم پیاوە تۆڵەسەندی کارێکی رەوایە کە ئەویش تۆڵە سەندنی خوێنی عثمانە . هیچ سەیر نیە . کاتێ کە سوپای هەردوو لا لە صفین تێکەڵاو بوو (بەدڵ نەبێ بەخۆی‌و دووسەد سێ‌سەد سواری قورئان خوێنەوە . .[11] کە دوایی بوونە (شراة)و پیاوانە پشتیان نابوو بە پشتی یەکەوەو لەشەردا بوون)[12] لە سوپاکەی علی کەس شەری نەئەکرد . پاشان تۆقاندنو شکاندنی سوپای علی هاواری یەکێکی وەکو ئەحنەفی کوری قەیسی بەس بوو کە ئەیوت (عەرەب لەناوچوو)[13] ژمارەی کوژراوانی هەردوولا گەیشتە حەفتا هەزار کەس‌و بەشی زوریان لە سوپای علی بوون .[14]

ئەوەشی کە لە مەدا بەتەواوی گومان نەهێڵێ ئەو بانگەوازی ناوبژی کردنەی کە کرا خۆشی نایە ناو دڵی بەشی زوری سوپاکەی علی‌و ئەوەشی کە مانەوەو (تحکیم)یان پەسەند نەکرد بەشێکی کەم بوونو ئەم بەشە کەمەش ئەو دەستە قورئان خوێنە بوون کە سوور بوون لەسەر ئەوەی شەر نابێ رابوەستێ‌و یان ئەبێ لە ناوبچن یاخود ئەبێ سەرکەون ، ئەمانە بوون کە دوایی بوونە (شراة) ، بەڵام علی دوای ئەوەی کە بانگەوازەکە کرا شوێن بەشە زۆرەکە کەوت و (تحکیمی پەسەندکردوو پشتی کردە بەشە کەمەکە[15] کەدژی پەسەند کردنە کە بوو جا ئایا هەرچیەك بووبێ ، پەشیمانی و لاوازی ، یاخود بۆ مەبەستێکی راست

ئەنجامی گومان کردن سەری هەڵدابێ‌و گومان کردن بووبێ لە هەڵوێستی علی[١٦] و بەو پەسەندکردنە ئەو گومان کردنە نەهێڵین کارەکە بە پەسەند کردن دوایی هات[١٧] عیراقی‌یەکان ئەڵێن کە پێی ئەوەی خۆیان عیراقی‌یەکان گێڕوایانەتەوە بەرپرسیاری ناچاربوونی علی ئەگەڕێتەوە ئەستۆی بەشە کەمەکەو ئەمەش ڕاست نیە . چونکە علی بۆ ئەوەی دڵی ئەو بەشە زۆرەی لە گەڵیدان لێی نەرەنجێ‌و بە پێی ئارەزوو خواستی ئەوان بڕوات (تحکیم)ی پەسەند کرد کەواتە ناچار کردنە کە لە ئەستۆی بەشە زۆرەکەدایەو بەشە کەمەکەش هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوەنەبێ بەرهەڵستی علی بکەن لەسەر ئەوەی کە شەڕی ڕاگرتووەو (تحکیم)ی پەسەند کرد . ئەم پێ ناخۆشبوونەی دەستەی قورئان خوێنەکان بەرامبەر بە پەسەند کردنی (تحکیم)لە لایەن علی‌یەوە هۆیەکی سیاسی هەبوو . بەلایانەوە وابوو ئەگەر بێ‌و (تحکیم) بە قازانجی معاویە بشکێتەوە ئەمان لەناوچوونیان لەمەیدانی جەنگدا بە لاوە گەلێ پێ‌خۆشترە لەوەی کە بکەونە ژێرزەبرو زەنگی معاویەوە ، وەك وتمان ئەمانە دەستیان لە کوشتنی عثماندا هەبوو بۆ علی لە بەشە زورەکە دڵسۆزتر بوون .[١٨] بێجگە لەم هۆیە هۆیەکی ئاینیش هەیە ئەویش ئەوەیە قورئان خوێنەکان بەرامبەر بە مافێك کە خوا داویەتی بە علی کە ئەویش ماف وەرگرتنی خەلافەتەو دەستبەردار نەبوونێتی لە مەسەلەی (تحکیم)دا دەستیان لە ڕێبازی شەریعەتی موسوڵمانانە بەرنەداو (تحکیم)لە لایەن ئادەمیزادەوە بەلایانەوە لەرێ لادانی ئەو شەریعەتە برو علی بە پەسەندکردنی (تحکیم) کفری نیعمەتی خوای کردووەو ئەگەر تۆبە نەکات ئەمان ناچنەوە لای‌و خۆ ئەگەر علی هاتوو مەرجەکەیانی پەسەند نەکرد ئەوا بەتەواوی بەجێی ئەهێڵن . هەروەها ئەو دەقانەشیان هەن کە دژی ئەوەن گوایە (شراة) علی کوری ئەبو طالبیان ناچار کردبێ ناوبژی کردن پەسەند بکات ، ئەوەشی بەرهەڵسکاری (شراة) بەرامبەر بە علی دووپات بکاتەوە ئەوەیە کە هەر لەبنەرەتەوە مەسەلەی (تحکیم)یان نەویستووە .

ئیبن حیون کە مێژوونووسێکی شیعەیە لە نووسینەکەیدا (شرح الأخبار) دا کە لە یحیی‌ی کوری ئادەم‌و ئەویش لە حبیب کوری أبی ثابتەوە کە (یەکێکە لە پیاوانی صفین) وەری‌گرتووە ئەلێ : ( . . . کاتێ عمرو بانگەوازی (تحکیم)ی ڕاهێشت . . بەشی زوری خەڵکەکە بەلای ڕێکەوتندا لایاندا ، (شراة)ەکان کە ئێمە بە قورئان خوێنەکان ناومان بردن شمشێرەکانیان نابووە سەر شانیان‌و هاتن بە علی‌یان وت : ئەی میری موسڵمانان تۆ ڕێگەمان ئەگریت‌و نایەڵیت کە زەبرەوزەنگی خۆمان بگەیەنینە ئەوانەو شەڕ یان لەگەڵیدا بکەین‌و هەرچیەك ئەبێ ئەوکاتە خوا لەنێوانماندا ئەبێتە حاکم .[١٩] ئیبن قوتەیبە ئەڵێ :[٢٠] ( . . کاتێ علی گوێی لەقسەکەی ئەشعەث بوو خۆشی خەڵکەکەی بینی کەپێیان خۆشە شەڕ نەکرێ ڕێکەوتنی پەسەند کردو ئەوانەشی کەدژی علی بۆ مەسەلەی (تحکیم) ڕاوەستان قورئان خوێنەکان بوون لەم قورئان خوێنانەش (عبداللەی کوری وەهەبی ڕاسبی)بوو کە شمشێرەکانیان نابووە سەر شانیان‌و بە علی‌یان وت : ئەوە لە خوا ناترسی . . تۆ چ بەڵێنێکت بە ئێمە دا وبەشیان بوویتەوە لێی . . . ئیستاش وازمان لێبێنە باشە ڕیکەین جا یان دوژمنەکانمان لەناوئەبەین یاخود ئەیانهێنینەوە سەر ڕێگەی ڕاست‌و تۆشیان وا دێتە بەرچاو مل‌کەچی خواستی ئەم دنیایەیت ـو ئەمەش لە خوا یاخی‌بوونە . فەرموو دەی دەست‌بدەرە باڵیان‌و دژی دوژمنەکانمان ڕاستمانکەرەوە تاحوکمی خوا بەزەبری شمشێرەکانمان بکەین‌و چەند شەڕبکەین خوا حوکمی خۆی بەسەرماندا ئەدات‌و ئەویش باشترین حاکمە . مێژوونووسێکی نەناسراویش . . لە نووسینێکیدا[٢١] بەناوی (کشف الغمة لأخبار الأمة)دا ئەلێ : (شراة) ئەوانەن کاتێ ئادەمیزاد (حاکم)یان‌کرد ، لە علی کوری ابی‌طالب زویربوون‌و سەرزەنشتیان کردو ڕێیان لی‌گرت‌و نارەزاییان بەرامبەر دەربری علی‌یش کە ئەمەی بەراست زانی تۆبەی کردو تۆبەکەی خۆی پیشاندان ئەوانیش کەدیان علی تۆبەی کردووە گەڕانەوە لای‌و تۆبەکەیان لێ پەسەند کرد . . . بەلام علی دوای تۆبەکردنەکەی لەمەسەلەی (تحکیم)دا لەقسەیان دەرچوو . .) .

بێجگە لەمانە تێبینی تریش هەن کە دووپاتی ئەم بۆچوونەی ئێمە ئەکەنەوە ، لەوانەش بەرچدانەوەی ئەم خواستەی علی‌یە کەوتی : عبداللەی کوری عباس بچێت شەڕ لەگەڵ (شراة) بکات‌و عبداللەش بەگوێی نەکردو نەچوو :[٢٢] ئەمەش لەو باوەڕەوە بوو ئەو بەرهەڵستکاری‌یەی (شراة) ئەیکات شتێکی ڕاستەو بانگەوازەکەشیان لە خواستی (آل البیت)نەچووبووە دەرێ .

دیسانەوە دوای ئەوەی کە مەسەلەی (تحکیم)تەواوبوو ئەنجامەکەشی لەگەڵ ئەو تەڵەکەبازی‌یەی کە عمروو معاویە کردیان بۆ علی ساغ‌بوونەوە لەسەر ئەمانە هات نامەیەکی بۆ (شراة)ەکان نووسی کە ئەو دەمە لە نەهرەوان بوون‌و پەشیمانی خۆی لەنامەکەدا لە مەسەلەی (تحکیم) دەرئەبڕێت‌و ئەڵێ ئەو ڕایەی کە هەتانە ڕاستەو ئەڵێ : فەرموون با بە دڵی ئێوە کاربکەین‌و بگەڕێینەوە سەر کارەکەی پێشوومان ئەو کارەی

داواتان لیٚ‌کردین بەرامبەر دوژمنان . . دوژمنەکانی ئیٚوەو دوژمنەکانی ئیٚمە بیکەین تا خوا حوکمی خۆی لە نیٚوانماندا ئەداو هەر خواشە باشترین حاکم بیٚت .[23]

خۆ ئەگەر (شراة) دووربن لەو تاوانبارکردنەی کە علی‌یان ناچار کردبیٚ (تحکیم. پەسەند بکات‌و علی‌یش رق لە عیراقی‌یەکان هەڵسابیٚ لەسەر ئەوەی کە لەبەر دڵی ئەوان (تحکیم)ی پەسەند کردبیٚ ، ئەبیٚ بگەریٚین بە دوای ئەو دەستە نالەبارانەی خەڵکی عیراقدا کە بوونە هۆی ئەوەی علی مل بۆ (تحکیم)کەچ بکات .

سەرچاوەکان سوننەو شیعەو (شراة)[24] بەگشتی پەنجەی تاوانبارکردنی پەسەند کردنی (تحکیم) لە لایەن علی‌یەوە بۆ میرەکانی تیرەی (کەندە)و سەردارەکەیان ئەشعەثی کوڕی قیس رائەکیٚشن . میٚژوونووسانی سوننی دەستنیشانی ئەو دەورەی ئەشعەث ئەکەن کە گیٚڕاویٚتی بۆ ناچارکردنی علی کە ئەبو موسای ئەشعەری لە (تحکیم) دابنیٚتە دەمڕاستی خۆی چونکە علی پیٚ‌ی خۆش نەبووە کە ئەبو موسای ئەشعەری بنیٚتە دەمڕاستی‌و ئەشعەث لەبەر ئەوەی کە سەرکردەی هۆزەکانی یەمەن‌بوو لە سووپای عیراقدا علی ناچاربوو بەگوی‌ی بکات[25]

تەنانەت مەسعودی .[26] ئەیگیٚڕیٚتەوە : علی بە ئاشکراو بەرەورووو ئەشعەثی بەوە تاوانبار کرد کە دەستیٚکی زور گەورەی لە مەسەلەی هیٚنانە پیٚشەوەی گوٚبەندی (تحکیم) دا هەیەو ئەم کارەش وای لە میٚژوونووسان کردوە بۆ ئەوە بچیت کە کردەوەکانی ئەشعەث لەناو سووپاکەی علی‌دا دووبەرەکی نانەوەو بیٚ‌هیٚز کردن بووەو بەزەبری ئەشعەث علی ناچاربووە کە دەست لە مافی رەوای خۆی کە خەلافەتە هەڵگری‌و لە نامەی (تحکیم)دا ناوی (میری موسڵمانان) نەنووسیٚت ،[27] هەر ئەویش بوو مەرجی لەگەڵ علی‌دا کرد کە بە سەربازە یەمەنی‌یەکانیەوە بچیٚت شەڕ لەگەڵ خەڵکی شامدا بکات ، بەڵام مەرجەکەی وەدی نەهیٚناو ئیتر کە علی ناچاربوو خۆی بچیٚت شەڕ لەگەڵ خەڵکی شامدا بکات[28] ئەشعەث لەمەش پەشیمانی کردووەو هەر ئەویش بوو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە علی بۆ ئەوەی سوپاکەی خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات ئەبیٚ لە کوفە پشووی بۆبدات .[29]

میٚژوونووسە سوننەو شیعەکان دەوری ناشیرینی ئەشعەث ئەوەندە بەخراپی ئەگیٚڕنەوە کە گەیشتۆتە رادەی ئەوە کە قسەی خوی لەگەڵ کوڕی ملجم‌دا بکات بەیەك‌و علی بکوژن‌و ئەوەبوو کارەکەش بەکوشتنی علی کۆتایی پیٚ‌هات .[30]

گیٚڕانەوەی (شراة)ەکان سەبارەت بەو بەرتیلەی کە معاویە بە ئەشعەثی ئەدات‌و بەڵیٚنی ئەداتیٚ کە دەمی چەوربکات ئەڵیٚن : بۆ ئەوەی سووپاکەی علی پەرت بکەن‌و لاوازیی‌و هیچی پیٚ‌نەکریٚ ئەشعەث مەسەلەیەکی هیٚنایە پیٚشیٚ مەبەستیش لە هیٚنانەپیٚشەوەی ئەم مەسەلەیە ئەیویست بەتیریٚك دوو نیشان بشکیٚنی . .[31] یەکەم پاڵ بەعلی‌یەوە بنیٚت لە نەهرەوان شەڕ لەگەڵ (شراة) ەکان بکات ، . . دووەم علی لە باشترین سەرکردەو دلسۆزترین سەرباز بیٚ‌بەش بکات .[32]

لیکۆڵەرەوە نویٚکانیش ئەوی دەوری ناپاکی ئەشعەث دەربخات فەوزی‌یە[33] و ناوی ئەشعەثی ناوە ناپاکی هەرەگەورە (الخائن الأعظم) چونکە لەگەڵ عمروی کوڕی عاص‌دا بۆ پەشیان کردنەوەی علی‌و دووبەرەکی نانەوەی ناو سسوپاکەی علی ریٚکەوتن . بەلای دوکتۆر طە حسین‌ەوە[34] وایە کەپیٚلانیٚك لە نیٚوان ئەشعەثی فیٚڵبازی عیراق‌و عمروی کوڕی عاصی تەڵەکەبازوو زیرەکدا ریٚکخراو ئەمانەش ئەو کەسانەبوون کە لە ناو سووپای علی‌و معاویەدا دارایی ئەم دنیایەیان لەهەموو شتیٚك لا مەبەستترابوو . لەکاتیٚکا ئەم گیٚڕراوانە هەموو ئەشعەث تاوانبار بکەن‌و بە ناپاکی دابنیٚن میٚژوو نووسانیش هەت بەرگری لیٚ ئەکەن‌و هەڵویٚستەکانی بە چاك لەقەڵەم ئەدەن .

یەکیٚکیش لەوانە دینوری‌یە[35] ئەڵیٚ : ئەشعەث یەکەم کەس بوو بیری ئەوەی کردەوە خویٚن نەریٚژری‌و کوشتار نەکری‌و ئەم بیرکردنەوەیەشی لە مەبەستیٚکی پاکەوە بوو تاخویٚنی موسوڵمانان نەریٚژییٚنری‌و ئەو ترسەی خستە بەرچاوی خەڵکەکە : گوایە "خاپاندنی جەنگ لەبیٚخ دەرهیٚنانی عەرەبەو ئاوات لە دەست دانە) . دیسانەوە لەسەر ئەم قسەی ئەشعەث دینەوەری وابۆ مەسەلەکە چووە کە ( ئەشعەث یەکەم کەس‌بووە بیری لەوستانی شەر کردۆتەوەو ئەم بیرکردنەوەیەشی معاویە زوری پیٚ‌خۆشبووە . مەبەستەکەی ئەشعەث لەو ترسەوە بووە (کە رۆمەکان چەند مەترسی‌یان بۆ سەر خەڵکی شام‌و فارسەکان چەند مەترسی‌یان بۆ سەر خەڵکی عیراق‌بووە) ئەمەش هەر نیازیٚکی پاك‌و بەکەڵك بوو . ئینجاهات داوای کرد قورئان لەهەموو لایەکەوە بەرزبکریٚتەوەو (تحکیم) بە پیٚ‌ی نووسراوی خوابیٚت‌و علی‌یش ئەمەی پەسەند کردو پیٚ‌ی قایل‌بوو .

دینەوەری لەوەدا کە بۆی چوو ئەوهەڵویٚستانەی کە بوون وەك پیلانکردنیٚك نابینیٚ . ئەمەش ئەودیاردیەیە کە یولیوس فلهاوزن[36] ئەیگیٚڕیٚتەرەو ئەڵیٚ : « گەڕان بە دوای ناپاکاندانە

کەڵکی هەیەو نەشوێن» و مەسەلەی ناپاکیی‌و لەژێرەوە رێکەوتنیش دوور ئەخاتەوە کە گوایە هیچ هویەك نەبووە تاوەکو بێنەکایەوە .

لەم گێرانەوە زۆرانەدا راست‌و رەوان ئەو سروشتە تایبەتی‌یەی ئەشعەث دەرئەخەن لەو هەڵوێستانەدا کە پێش جەنگی صفین بوویەتی‌و لەجیِ‌ی ناپاکیدا دای‌ئەنێن . . ئەو دڵسۆزی‌یەشی بەرامبەر بە علی‌و ئەو مەبەستە پاکەشی کە نەیویستووە خوێنی موسوڵمانان بڕێژی‌و داوای (تحکیم)ی کردووە . . ئەوەی کە لە مانەدا راست‌و دڵسۆزانەبیِ ئەوەبوو کە توانی سەرچاوەی ئاوەکان لە سوپاکەی معاویە بسەنێتەوە کە ئەیویست عیراقی‌یەکان لێیان نەخۆنەوەو لە تینواندا بمرن .[37]

بەڵام ئەوەشی کە جیِ‌ی گومان بیِ لەم دڵسۆزی‌و راستی‌یەی ئەشعەث ئەوەیە کە ئەشعەث زیاتر لەوەی دڵسۆزو راست‌بیِ بەرامبەر علی‌و عیراقی‌یەکان مەبەستی پاراستنی ژیانی هۆزەکانی یەمەن‌بوو کە خوی سەرکردایەتی ئەکردن‌و لەریزی سووپای علی‌دا بوون .[38]

هەروەها ئەوەشی دەربارەی ئەوە ئەگێرنەوە کە معاویە ویستویەتی ئەشعەث بەلای خویدا راکێشیِ‌و ئەشعەث نەچووەو خۆی بەدەستەوە نەداوە ئەمەشیان هەر لەبەرچاوی جوانی علی‌و عیراقی‌یەکان نەبووە . . لەبەر ئەوەبووە کە دوژمنایەتی‌یەکی تەقلیدی لە نێوان هۆزەکانی یەمەنی سەر بە ئەشعەث‌و قەیسی‌یەکانی سەر بە معاویەدا هەبووە[39] و ئەشعەث بەریِ‌ی گرەوکردل لەسەر ئەسپی‌سەرکەوتووی مەیداندا بۆ پایەی لای سەرووی ئەڕوانی .

ئەو هەڵویستانەی کەپێش روودانی جەنگی صفین هەبوون هەموویان پەنجەی بەرزبوونەوەی ئەستێرەی علی‌یان رائەکێشا بە تایبەتی دوای ئەوەی کە علی لە جەنگی جمل‌دا سەرکەوت ، ئەشعەث لەم دەمەدا یەکێك بوو لەو کەسانەی مەسەلەی تیرەگەرایەتی ئەخستە پێش ئەو مەسەلەیەوە کە جۆشی بۆ ئاین هەبیِ‌و دڵسۆزی سەرکەوتنی دۆست کانی بیِ‌و زمانی حالیشی وا ئەدویِ کە لە زەمانی پێغەمبەردا(د .خ)نەیتوانی لەبەر هێرشی لافاوی موسوڵمانێتیدا خۆی راگریِ‌و بەناچاری موسوڵمان بوو . دوایی کە پێغەمبەر (د .خ)کۆچی دوای کرد ئەشعەث لە ئاینی موسوڵمانێتی هەڵگەرایەوە ، بێجگە لەمەش کە ئەبوبەکری صدیق خەلیفەبوو ئەشعەث لایەنگیرانی خۆی دژی ئەبوبەکر راست کردەوەو جەنگی (رەدە)ی هێنایەکایەو دوای ئەوەی کە هیچی بۆ نەکرا بووەوە بە موسوڵمان‌و تۆبەی بۆ ئەبوبەکردو ئەویش زور بە نابەدڵی تۆبەکەی پەسەندکرد .[40] سەردەمی خەلافەتی عمر . . لەبەر تواناو دەسەلاتی عمردا نەیتوانی هیچ شتیِ بکات ، لە لاوازی عثمان کەڵکی وەرگرت‌و کچەکەی خۆی بە عمروی کوڕی عثمان‌داو بەمە ناوی کەوتەوە ناوناوان‌و .[41] ویلایەتی ئازربایجانی دەسگیربوو . کە عثمان کوژرا خەلافەت بە علی دراو دەستی ئەشعەث لە میرنیشنی‌یەکەی کێشرایەوەو ئەم کارەش وای لی‌کرد مەرگی علی بە ئاوات بخوازیِ ، لەبەر ئەو ش دژی علی رانەوەستاو شوێنی کەوت چونکە پایەی علی ئەودەمە رۆژبەرۆژ بەهێزترو بەرزتر ئەبووەوە[42] بەڵام کە دی ئەستێرەی سەرکەوتنەکانی علی‌و بەهێزبوونی بەرەو کوژانەوەو ئاوابوون ئەچیِ لەپشتگیری کردنی ساردبووەوەو ئەو رەق‌و کینەیەی کە هەیبوو کەوتنەوە سەر هەڵدان .جا لە گەڵ ئەوەدا ئێمە لە درورخستنەوەی ئەشعەث لە رێکخستنی گەمەی (تحکیم) لەگەڵ عمروی کوڕی عاصدا پێچەوانەی فلهاوزن نین .[43] گومان لەو دەررە تایبەتی‌یەش ناکەین کە ئەشعەث لەناو خەڵکدا ئەیگێراو بانگی ئەکردن بۆبڕوپا گەندە کردن لە ناو تیرەکاندا . لەبەر بوونی گومان‌و لاوازی باوەڕیان بانگەوازی لە شەڕ پەشیمان کرد نەوەیان بەهەل زانی‌و بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دانانی سنوورێك بوو بۆ روونەدانی کارەساتی گەورە گەورە .

ء مانە گشتی رەفتاربوون و روویان کردە ناو ریزەکانی سووپای علی‌و ئەشعەثیش جا ئایا بە مەبەستی باش‌بوونیِ یاخود بەفێڵ بۆ هاندانی بەشی زۆری سووپاکەی علی تاوەکو شەڕراوەستێنن ئەم هەلەی لەدەست نەدا . .

ب لهّم ئەمە خۆی واتە چەسپاندنی بیروباوەڕی (تحکیم) ناچارکردنی علی‌یە بۆ شەڕنەکردن‌و پەسەندکردنی (تحکیم) و کپ‌کردنی جوشی گەرمی ئەو کەمە دڵسۆزەیە کە لایەنگیری علی‌بوون‌و (تحکیم)یان نەویست‌و بۆ بیِ‌هێز کردنی سووپای عیراق لە نەهرەوان هەندێکیان لەناوبران‌و ئەنجامەکەشی ئەوەبوو سووپای علی بەتەواوی وێرال‌کرد ؛

بەکورتی‌یەکەی لە سووپاگاکەی علی‌دا دەردی لاوازی ئەنجامە سروشتی‌یەکەی رەنگدایەوەو لەبەر ئەوەی کە جلەوی بەدەست علی‌یەوە نەمابوو نەئەتوانرا شەپۆلی شەڕ راگرتن بووەستێنریِ‌و بەشە زۆرەکە کە شەڕیان نەئەویست بەسەریا زاڵ‌بوون‌و ناچاریان کرد دەست لەمافی خۆی لە ئیمامەت هەڵبگریِ‌و بە (تحکیم) رازی‌بیِ .

ئەوەی کە ئەمالەویِ لێرەدا بەکورتی بیلێین پاکی ئەو قورئان‌خوێنانەیە لە بوونە (شراة)و (تحکیم) یان پەسەند نەکردو

ئەم کارەشیان هەڵوێستێکی سیاسیی و ئایینیبوو وای لیٚکردن راپەڕین و قارەمانانە بەرەنگاری مەسەلەی (تحکیم) راوەستن و خوێنی خۆیان لەپێناویا برێژن ، ئەوەشی کە پشتی ئەم راستیەمان بگرێ دروشمی یەکەمیانە کە بەرزیان کردەوەو[٤٤] .

بانگیان ئەکرد (حوکم هەر بۆ خوایە) . ئەڵێن پیاوێك لەدەنگدەران لە تیرەی (بنی یشکر) لە صفین ل ەلْ علیبووە . . کاتیٚ کە رێکەوتنەکەی هەردوولایانی دیوە سواری ئەسپەکەی بووەو هەڵمەتی بردۆتە سەر لایەنگیرانی معاویەو پیاوێکی لیٚکوشتن و ئینجا بایداوەتە سەر لەشکری علی و پیاوێکیشی لەوال کوشتووە بەلام لایەنگیرانی علی پەلاماریاندا پیاوێك کە هەمەدانیبوو ئەم کابرایەی کوشت .[٤٥] هەروەها ئەڵێن یەکەم کەسیش کە خۆی توندکردەوە عمروی کوڕی ئەریە بوو بە شمشێرەوە چووەسەر ئەشعەث لەم دەمەدا ئەشعەث بەڵگەنامەی (تحکیم)ی بۆخەڵکە کە ئەخوێندەوەو شمشێرێکی بۆ ئەشعەث داهێنایەوە ئەشعەث خۆی لاداو بەری نەکەوت . ئەشکێرنەوە[٤٦] کە دوو برا لە هۆزی عنزە ناویان – جعد ، کعدان – بوو بەرووی ئەشعەثدا قیژانیان (حوکم هەر بۆ خوایە)و شمشێریان بۆ داهێنایەوە ئەمجارەش بەرنەکەوت و دوای هێرشیان بردەس ر خەڵکی شهم و تا کوژران شەڕیان کرد . لەو تراوێکی تردا .[٤٧] ئەڵیٚ یەکەم کەس کە هاتە مەیدان و شمشێرەکەی دژی (تحکیم) راوەشان (سعیدی کوڕی محارب)بوو لە تیرەی قیسی عیلانبوو . لە گێڕراوەیەکی تریشدا[٤٨] ئەڵێن حجاجی کوڕی عبداللە کە بە (برك) ناسراوە یەك م کەس بووە دژی (تحکیم) هاتۆتە مەیدانەوەو شمشێرەکەی ، رادوەشاندووە .

ئەم هەواڵانە چەندە لەیەکتر جیاوازبن بەلاٚم ئەوە بەدەستەوە ئەدەن . . (دژی ئەو هەواڵە عیراقیانەی کە ئەڵێن (شراة) پشتیان بەبانگ‌ك راهێشتن نەبەستووە) (شراة) پشتیان بەپەسەند نەکردنی (تحکیم) بەستووە ، ئەمەش تەقەللادانێکی ساکارانەیە کە جیاوازییەکی لەناو کۆن و تازەدا هێنایە کایەوەو . . ئەم راستیەش تەنانەت لەوانەش شاررایەوە کە هاریسەردەمی مەحەلەکە بوون ، بەلاٚم وەنەبیٚ ئەم کارەی کەوا لەگەڵیا ژیان لێکۆڵینەوەی دەربارە نەکرابیٚ بگرە بەزۆری دەمەتەقییان کە لە سەری ئەکرد هەر وەك مەسعودی ئەیگێڕێتەوە ،[٤٩] بهوك و کوڕو برا هەر بە بەسەرزەنشت و بۆکس و دەسکی شمشێربوو .

هەڵوێستی (شراة) هەر وەك هەڵوێستێکی سیاسیبوو هەڵوێستێکی ئاینیش بوو ئەوو تەقەللایەی ئەیاندا کاتیٚ کە مەبەستەکەیان روون کردەوە بۆ خۆیان دەستیان بەو مەبەستەو وەدیهێنانییەوە گرت و بۆ ئەم کارەش نەهاتن شتی نەفرەت لیٚکراو بهێنن و رێگەی خواروخێچ بگرنەبەر ، بگرە شۆڕشێك بوو نیازەکەشی دەرخستنی ئەو بیروباوەڕە بوو کە هەیانبوو[٥٠]

مێژوەنووسانی (التشریع الأسلامی) وتوویانە : دڵسۆزیی (شراة) بەرامبەر بە باوەڕ کەیان و چوونە مەیدانی جەنگیانەوە بۆ مەبەستێکی دنیایبوو ، ئەگەر وەك ئەزاریق هەڵەیان نەکردایە چاکترین مجاهد بوون لەرێگەی خوادا .[٥١]

لەبەر ئەوە زۆرکەس هەبوون لەگەڵ ئەوەشدا کە لەگەڵیال نەبوول بەلاٚم خۆشیان ئەویستن و ئارەزووی سەرکەوتنیان ئەکرد .

ئەوەتا علی کوڕی ئەبی طالب خۆی یەکەم کەسبوو پەشیمان بۆتەوە لەوەی کە بەقحەی نەکردن و ئەڵێن : لە کۆتایی ژیانیدا وتویەتی دوای من نابیٚ شەڕ لەگەڵ ( شراة ) بکەن ، چونکە ئەوەی راحتی داوا ئەکردوو بەهەڵە بۆی چوو وەك ئەو نیە خراپەی داوا کردبی و زانیبێتی . مەبەستیشی لەمە ئەوەیە (شراة)ەکان بەرگری لەبیروباوەڕەکەیان ئەکەن . هەر وەك مامۆستا احمد أمینیش ئەڵیٚ :[٥٢] بیروباو رێکی ئەوەندە پتەویان هەبووە کارەساتەکان نەیانتوانیوە تۆزیٚ لەقیبکەن و جوشەکەشیان ئەوەندە بەهێزبوو شانبەشانی گیانپاکیی و راستگۆیی و قسەو کردارپان ئەرۆیی ، لەکەسیش نەئەترسان و لەهیچ شتیٚ نەئەگەڕانەوە کە لەسەر بیروباوەڕەکەیان بوایەو دیموکراتییەتەکەیان دیموکراتییەتێکی راستبووە . میرەکانیان بەو چاوەوە تەماشا ئەکرد کە یەکێکە وەك خۆیان و گەورەکانیشیان لا وابوو کە ئەبیٚ رێگەی چاکیان نیشانبدات و خزمەتیان بکات و رێگەکەشیان ئەبیٚ چەوت و تەمومژاوی نەبی و میرەکانیش ئەبیٚ لەسەر رێگەی راست برۆن و ئەگەر هاتوو نە رۆیشتن ئەبیٚیان خۆیان واز بهێنن یان ئەبیٚ بەشمشێردا بگیریٚ تا کو ئەکوژریٚ و موسوڵمانیش ئەبیٚ بەپیٚی دەقی قورئان و ریٚرەوی موسوڵمانێتی برۆن و نابیٚ بەقەدەر تاڵە موویەك لیٚی لادەن ئەگینا ئەبیٚ بکوژرێن تاوەکو موسوڵمانی دڵسۆزو پاك جێگەیان بگرنەوەو ئەم رێگەیەش ئەبیٚ بە وریاییەوە بگیریٚ و شەرم و خوایشی تیا نەبیٚ و واقیع چۆنە وا بەرەورووی بنەوەو هەڵی سەنگێنن و خۆی چۆنە وا چارەسەربکریٚ .

(شراة)ەکان لەبەر رووناکی ئەو بیرو باوەڕەدا بیٚ چاوپۆشین لەهیچ شتیٚ تەماشای خەڵکیان ئەکردو نەئەهاتن لەبەررووناکی خەڵکدا تەماشای بیروباوەڕ بکەن ، درۆو کاری خراپیان نەئەویست . لە (الضحی – بەرگی ٣–ل ٣٤٤) دا باسکراوە ئەو رۆشنبیرییە یاوەی سەردەمی خۆیان کە بوویانە رۆشنبیری

موسوڵمانێتی بووە .

دەمەتەقێشیان لەگەڵ هەرکەسێ کردبێ دەستبەرداری دەقەکانی قورئانو ڕێگەی موسوڵمانێتی نەئەبوونو ئەبوایە وشە بە وشە لەسەری بڕۆیشتنایە .

شێخی بەڕێز جلال حنفي لە پشکنینکاری‌یەکەیدا سەبارەت بە شوراتەکان ئەڵێ : بەڵام لایەنی دووەمی مەبەستەکانی (شراة) بنیاتنانی زانینو ئەحکامەکانی بوو ئەمەش بەپێی ئەو نەخشەیەی کە خۆیان نەخشیان کێشابۆو ئەبوو وەدی بهێنن و کەسێکیش گەر لەخۆیان نەبوایە هەرگیز ڕێگەی ئەوەیان نەئەدا دەمەتەقێی ئاینیان لەگەڵدا بکاتو[٥١] نەشیان هێشتووە (ڕا) دەربارەی موسوڵمانێتی دەرببڕێ . لێرەدا ئەوەی کە ئاشکرابێ ئەوەیە بەری ئەم زانیاری‌یەیان فراوان نەبووبێ‌و تەنگەبەرو تەسك بووبێ‌و ئەمەشیان لەبەر ئەوەبووە کە گیانی شۆڕش کردنو ڕاپەڕینیان بەرامبەر بە کاربەدەستان ماوەی ئەوەی نەداون ئەم زانیاری‌یەیان بگەیەننە پلەیەکی خواستراو .[٥٢]

لەنووسینی (الحركات السرية في الاسلام)[٥٣] وا ڕوونە دەرکەوتنی (شراة) ئەنجامی ناکۆکی‌یەکانی باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی بووەو ئەم ناکۆکی‌یەش بووە کە وای لێ‌کردوون بەرووی بناغەی ئەو گیروگرفتەی لەسەر مەسەلەی ئیمامەت هەیە بتەقێتەوەو ڕێگەیەکی ئاینی وەربگرێ‌و لێرەوە کۆمەڵی (شراة) ئەبنە پارتێکی سیاسی‌و دادوەری بەپێی ئاینی موسوڵمانێتی ئەویست . دووبارە لەگەڵ ئەوقسەیەی فلهاوزنیشداین کە ئەڵێ : پارتێکی سیاسی‌و ئاینی‌بووە ، چونکە فلهاوزن بەسەر ئەوەدا بازی داوە کە سەردەمەکانی ناوەڕاست پارتە سیاسی‌یەکان لە گەڵ ئەوەی کە بەرفراوانی‌یەکی ئاینی دەرکەوتوویان بووە مەودایەکی ئەوتۆی کۆمەڵایەتیشیان بووە کە دەستی گومان نەیگاتێ . ئەم دیاردەیەش هەردوو جیهانی موسوڵمانو مەسیحی گرتۆتەوە ، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو ئاینو دەوڵەت لەو سەردەمانەدا بە یەکەوە بوونو تێکەڵی یەکتر بوون . . بۆ نموونە . . تەماشا ئەکەین خەلیفە لە (دار الأسلام)دا لەلایەکەوە لەبەر ئەوەی خەلیفەی پێغەمبەر (د.خ) بوو ، لەلایەکی ترەوە حاکمی موسوڵمانەکان بوو دەسەڵاتی ئاینی‌و زەمەنی کردبوو بەیەك ، ئەوروپاش هەروا . . ئەوەبوو لەسەردەمەکانی ناوەڕاستدا بەهۆی ئاینی مەسیحی‌یەوە نەبوایە لەڕووی سیاسی‌یەوە یەکیان نەئەگرت . ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە کەنیسە دەسەڵاتێکی فراوانی هەبوو . .

زۆرانبازی نێوان پاپاو ئیمپراتۆر لاموایە شیکردنەوەی نەوێ ، کەنیسەش ئەودەمە ڕێکخراوێکی (ئەکلیریکی)بوو . . واتە دەرەبەگایەتی . . ئەمیش ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە ئەو دەمە مەسەلەی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی چۆن ئەبووە مەسەلەیەکی (لاهوتی) و ناکۆکیش لەسەر شێوازی کفرو باوەڕ) ئەنرخێندرا .

هێزی موسوڵمانی بەرهەڵستکاریش بەرامبەر (کاربەدەستان) بە کفرو بێ‌ئیمانی لەقەڵەم ئەدرا ، بەڵام شۆڕشگێرانی دژی پاپاوپەت هەر کەبریاری بێ‌بەشکردنی لە هەموو شتێ بەرامبەر دەربکرایە ئەوە ئیتر کەنیسە هیچ جۆرە بەزەیی‌یەکی پیادا نەئەهاتەوە .

ئەوپەڕی قسە ئەوەیە مەسەلەی ئیمامەن لەناو موسوڵماناندا دیاردەیەکە جیاوازی زانیاری‌و ئاسنی‌یەو ئەم جیاوازی‌یەش دەنگدانەوەی هێزە کۆمەڵایەتی‌یەکانو هەڵوێستی چینە زوران گرەکان بوو . ئیبن خلدون لەمڕاستی‌یە نزیك بۆتەوەو تا ڕادەیەکیش چۆتە ناخی‌یەوەو ئەڵێت : ئەو ناکۆکی‌یەی لەسەر مەسەلە خەلافەت بوو ئەو ناکۆکی‌یەبوو کە ئەنجامی ئەو تەقللایەی لەڕووی بیرو ئاینەوە ئەدرا هێنایە کایە .[٥٤]

(شراة) دەربڕی ڕای کەرتێکی فراوانی جەماوەری دژ بە خەلافەت بوونو ئەم هەڵوێستەش وای لێ‌کردن کە بە (جەمهوری‌یەکانی موسوڵمان) حساب بکرێن ، کەچی سوننی‌یەکان مافی ئیمامەتیان تەنیا هەر بۆ قورەیشی‌یەکان هێشتەوەو شیعەکان دایانە کەس‌وکاری پێغەمبەر (د.خ) . بەڵام (شراة)ەکان بانگیان کرد کە ئیمامەت مافی ڕەوای هەموو موسوڵمانێکەو پەیوەندی بەرەسەنو تیرەگەرێتی‌یەوە نیە . . لێرەدا (شراة) لە ناو پارتەکانی تری ناوموسوڵماندا لەڕووی سیاسی‌یەوە لایەنی دیموکراتیان گرت‌و چونکە بێ‌لێکۆڵینەوە بێ پێچ‌و پەنا دەستیان بە چمکەکانی ئاینو قورئانو ڕێگەی موسوڵمانی‌یەوە گرتبوو بانگ کردنە بێ‌گەردەکەشیان بەدوادا چوونی پێشوونانی چاکی وەك پێغەمبەر (د.خ)و ئەبوبەکرو عمربوو . دوزی لەم ڕووەوە ئەڵێ قسەکانیان (چاکە کردنو لەخراپە دوورکەوتنەوە)بووە . ئەم قسەیەیان هاندان بووە بۆ ئەوەی شۆڕش دژی ئیملمە زۆردارەکان بکەنو هەر ئەمەش بووکەوای لێ‌کردن شایانی نازناوی (شۆڕشگێرانی موسوڵمانان)بن .[٤٣]

هەندێ لێکۆڵەرەوەی شۆڕشگێر (شراة) بە بۆلشەفیکی موسوڵمان دائەنێن‌و ئەمەش بەپێی موفت‌کردنی خوێنی ئەوانەی کە دژی باوەڕەکەیان ئەوەستن‌و کوفت‌کردنی خوێنو بە کافردانانی ئەوانەش کە تاوانی گەورە ئەکەن .

ڕاوحوکمدانیان بەرامبەر بە تاوانی گەورەو بیروباوەڕیان لە

دادو ری‌و یەکسانیە رێگەی سۆشیالیحتی رەس نی موسوڵمانی تەواوی هەیە بۆ ئەم مەبەستە (میور) ئەڵێ :

بیروباوەڕی (شراة) بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕانەی دیموکراتی سۆشیالیستی‌یە .

دوکتور عزمی الصالحی[٥٥] هەمدیسانەوە . ئەمانباتەوە بۆ رووداوەکانی صفین‌و دەمەتەقێ‌ی بەرامبەرێن‌و ئەو گفت‌و گۆیانەمان پیشان ئەدات کە لە نێوان علی‌و سەردارەکانی (شراة)دا ئەکران‌و سەبارەت بە پەیدابوونی ئەم پارتەش ئەڵێ : پارتی (شراة) لەبەرپابوونی ئەگەری جەنگی صفینی‌دا سنگی هێنایە پێشێ ، علی لەبەر ئەوەی کە (تحکیم)ی پەسەند کردبوو بەسەر یا سەپێنرابوو ئەویش نەیئەویست لەم کارەی پەشیمان بێتەوە هەندێك لە سەربازانی سوپاکەی خۆی دژی راست‌بوونەوە . (شراة) نکولی لەوە ناکەن کە لە سەرەتادا پاڵیان بە علی‌یەوە نا تاوەکو (تحکیم) پەسەند بکات ، بەڵام ئەوەش ئەڵێن کاتێ کە بۆیان دەرکەوت فێڵەو درێژەپێدانی تەڵەکەبازی لە لێ‌ی پەشیمان بوونەوە ، لە گفت‌وگۆکردنیان لەگەڵ علی‌دا گەلێك دان بەوەدا ئەنێن‌و ئەڵێن : (مرۆڤ لە ئاینی خوادا حوکمیان کردو بەرای ئێمە ئەمە کفرەو پەسەند کردنیان بە کفر زانی ، بەلام ئێمە تۆبەی خۆمان کردو تۆش وەرە ئەو بریارە بدە کە ئێمە دامان‌و ئەو تۆبەیە بکە ئێمە کردمان‌و بەیەکەوە بەرەو شام هەڵدەستین هەروەها وتووشیانە (ئێمە بەوە تاوانێکی گەورەمان کرد کە لایەنی ئەوەمان گرت مرۆڤ لەئاینی خودادا (حاکم) بێ‌و ئەشبوایە علی وەك ئێمە توبەی بکردایە .[٥٦]

لە گفت‌وگۆیەکی تری نێوان علی‌و (شراة)ەکاندا علی پێ‌ی وتوون : (ئەرێ بۆ خاتری خوا / کەس هەبوو بەقەدەر من ئەم (تحکیم) کردنەی پێ‌ناخۆش بووبێ ؟)وتیان –نەء – وتی : لەبیرتانە زۆرتان لێ‌کردم کە پەسەندی بکەم ؟ وتیان بەلێ ، علی وتی : کەوابوو بۆچی دژم وەستان ورقتان لێ‌هەڵگرتم ؟ هەر لەبەر ئەوەی پەسەندم کرد ؟) وتیان : (علی حوکم هەر بۆ خوایەو بۆ تۆ نیە ، قایل نابین ئادەمیزاد لە ئاینی خوادا حوکم بکات‌و ، خوا حوکمی خۆی بەسەر معاویەدا داوە بەوەی کەی یال ئەبێ بکوژرێ یاخود بێتە ژێر دەسلاتی ئێمەوە ، ئێمە کە قایل بووین بەهەردوو حەکەم شتێکی نارەوامان کرد بەهەڵەدا چووین ، کاتێ بۆمان دەرکەوت شتێکی نارەوایەو بەهەڵەدا چووین گەراینە وە لای خواوتۆ بەمان کردو توش بگەرێرە وەلای خواو تۆبە بکەو داوای بەخشینی خوا بکە ، ئەگینا نەفرەتت لێ ئەکەین) ، رتیان (ئێمە تاوانێکی گەورەمان کرد بەلام توبەمان کرد ، تۆش تۆبە بۆ خوا بکەو پەشیمان بەرەوە لەگەڵتا دێین علی وتی : (من ویستم لەمەسەلەی تحکیم) دوورتان بخەمەوە بەلام نەمتوانی کە قایلتان بکەم) .

دوکتور الصالحی[٥٧] دەربارەی بەرگری‌کردن لە (تحکیم) ئەڵێت : بەشی زوری گێڕراوەکان لەسەرەتای بانگەوازی معاویە بۆ (تحکیم) بەرگری‌کردنێکی علی نیشان ئەدەن ، بەزۆریش ناچار کرا کە پەسەندی بکات‌و پێیان وت ئەگەر بۆ نووسراوی خوا بانگ‌کراین ناتوانین بەپیری‌یەوە نەچین ، علی وتی : (خوا خوی ئاگادارە من خۆم ئەم (تحکیم)ەم پێ ناخۆش بوو بەلام چونکە ئێوە زورتان لێ‌کردم من پەسەندم کرد) . کە پەسەندیشی کرد پێ‌ی لەسەر ئەوە داگرت پەشیمان نەبێتەوە .

عبداللەی کوری کواء هات بۆ لای علی وپێ‌ی وت : (ئەوە عبداللەی کوری قەیسەو رابەری خەڵکی یەمەن بوو کە چوونە سەردانی پێغەمبەر (د.خ)و بەشداری ئەو دابەش‌کردنانەی کردووە کە ئەبوبەکر کردنی‌و کاریشی لەگەڵ عمردا کردووەو کۆمەڵەکەشی لێ دڵگیر نەبوون‌و رابەرێتی ئەویان پێ‌خۆشە) .

بەڵام ئەوەی جێ‌ی سەرنج بێ ئەوەیە (شراة)ەکان بەلایانەوە وابوو کە پێ‌داگرتنی علی لەسەر درێژەپێدانی (تحکیم) وپاشگەز نەبوونەوەی لێ‌ی لەسەر حسابی بیروباوەری ئەوان کە شەریان لە پێناودا کردوو و قوربانیان بۆ داوەو جۆرەرێکە – وتنێکەو مەبەستەکە ئەوانن .

دوکتور صالحی سەبارەت بە دۆخی کۆمەلایەتی (شراة) ئەوە دەرئەخات کە (شراة) بەشی زۆریان گەرۆك ، دیهاتنشینی ساکارو قورئان خوێن‌و سەرگەرمی ئاین‌بوون‌و بۆ وەدیهێنانی باوەرەکەیان ئەوپەریان ئەگرت .

عبی‌اللەی کوری عباسیش وای بە علی وتووە : کە چووە لە (شراة) بدات ناوچەوانی ساف‌بووی زور نوێژکردنی لێ‌دیون‌و دەستیان وەك هەردوو شانی حوشتر ساف‌بووەو بەرگەکانیان خاوێن‌و لەدەست‌بڕ نەچوون‌و کاری خواپەرستی لەناوچەوانیاندا دیارە) . . نە یانویست ئادەمیزاد لە ئاینی خوادا (حوکم) بکەن‌و دروشمەکەشیان (حوکم هەر بۆ خوایە)بوو .

قایل بوونی علی بە (تحکیم) هۆیکی سەرەکی‌یە بۆ دەرکەوتنی ئەم پارتە . بەلام ئەو هۆیە هەروا تەنیا نەبوو ، چونکە ئەوە بەمێشك‌دا ناچێ کە ئەو پارتەی کە دژی دەسەلاتی بەنی ئومەیە تێ ئەکۆشاو شۆرشی ئەکردو جاری وا هەبوو لەگوێ پێچالی مردن نزیکی ئەکردەوە دروست‌بوونی تەنیا هەر بەهۆی مەسەلەی (تحکیم)ەوە بووبێ ، دیارە ئەو کەسە زۆر ساوێلکەو

خا کی نەبێ باوەر بەوە ناکات تەنیا یەك رووداو با ئەنجامەکەشی زۆر قووڵ‌و کاریگەرو فراوان بێ بتوانێ پارتێکی شورشگێری وەك پارتی (شراة) بهێنێتە کایەو دروستی بکات .[٥٨]

بەڵێ راستەکە پەسەند کردنی (تحکیم) لەسنکی زۆر کەسدا بڵێسەی شۆرشە خۆماتداوەکەی (دژی رەفتاری خەلیفەو مەبەستی ئەوەی کە خەلافەت بۆ وای لیهات‌و ئاین کە بووبووە مەبەستێکی تایبەتی – ئەو مەبەستەی کە نیاذی تایبەتی و بیروباوەری تیرەگەریتی پێش خوا ئەخست – بەرەو کوێ ئەچی) خۆش کردوو هەڵگیرسان . فروفێڵی (تحکیم) ئەو دەستەبوو کە لە دڵ‌و دەروونی زورکەسدا رەخنەو رق لێ‌بوونەوەی ئەوروژان‌و ئەم کارە بەم جۆرە پەرەی سەندو شۆرش بەرپابوو .

موسوڵمانەکان پێیان ناخۆش بوو ببین ئەو ئاینەی هەیانە نیازێکە چنۆکەکان زورانبازی لەسەر ئەکەن‌و گومان لێ‌کراوی تایبەتیانەش بە دەوریا بسوورێنەوە .

پێش صفین رای سیاسی جا یان شێوەی تاکەی یاخود تیرەگەریتی یاخود شێوەیەکی زۆر فراوانتری بووبێ‌و کارەکەش هەر وەك لەکوشتنی عثماندا سەری هەڵداو کارەساتی هێنایە پێشێ . پاش مەسەلەی (تحکیم)یش رێی بۆ گەلاڵە بوونێکی رێك‌وپێکتری شۆرش تەخت کرد . پاش ئەوە روونا‌کترین نیشانەش کە دەری بخات کە پارتی (شراة) ئەنجامی جەنگی صفین و مەسەلەی (تحکیم) پەیدا نەبوو ئەو رووداوانەن کە لەغەزای ولاتاندا هاتنە کایەوەو پەیدابوولی ئەم رووداوانەش ئەگەرێنەوە بۆ سەردەمی خەلیفەکانی راشدین‌و لە پەشێوی یەکەی (صفین)دا تەقینەوە . چونکە داخ لەدڵی (شراة)ەکان هەر بە وەوەنەوەستا کە علی (تحکیم)ی پەسەند کردووە و لێ‌ی پاش گەز نابێتەوە بگرە ئەگەرێنەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە پێش خەلافەتی علی‌و خەلافەتی معاویە کەوتبوون . توانجیان لە بەشدارانی جەنگی جمل ئەگرت‌و گاڵتەیان بە طلحەو زبیرو عهێشەو عبد اللە‌ی کوری عباس ئەکردر بە وردی بە درای کارەساتەکانی خەلافەتدا لە سەردەمی ئەبوبەکرو عمرو عثماندا ئەگەران‌و خەلافەتی ئەبوبەکرو عمریان پەسەند کرد رقیان لە عثمان لە سەر ئەوە هەڵگرت چوونکە پایەو کاروباری ولایەتەکانی سەر بە خەلافەتی بە خزمەکانی خۆی ئەداو شتی کەشیان لێ‌دیبوو .

جا وەك دەرئەکەوێ (شراة) ئەنجامی جەنگی صفین‌و مەسەلەی (تحکیم) پەیدانەبوون ، بگرە زۆر (را) هەیە ئەم پەیدابوونە پێش ئەم رووداوە ئەخەن‌و ء شی بەنەوە بۆ ئەو (را)یەی کە بەرامبەر بە خەلافەت بوویانە ، بۆ نموونە کاتێ کە زیاد والی ئەمەوی‌یەکان بوو لە عیراقدا عروەی کوری ئەدیەی بانگ‌کردو لێ‌ی پرسی : رات بەرامبەر بە ئەبووبەکرو عمر چی‌یە ؟ وتی : باشن ، پی‌ی‌وتەوە : بەرامبەر میری موسڵمانان عثمان چی‌یە ؟ وتی : عثمان شەش ساڵ خەلافەتی بە باشی کرد دوایی لەرێ‌ی لایداو بە کافرمان داناو علی‌یش سەرەتا باش‌بوو ئەویش کە دوایی تێکچوو بە کافرمان داناو وەك عثمانی بەسەرهات[٥٩] .

ئەم شتە ئەوە دەرئەخات کە ناتوانرێ بە ئاسانی باوەر بکرێ کە مەسەلەی خەلافەتی ئەبوبەکرو عمرو عثمان بەلای ئەم دەستەیەوە شتێکی توێ بێ ، ء مە لە لایەك لە لایەکی ترەوە کە ئەم مەسەلەیە کۆن بووبێ وسەردەمی بەسەرچووبێ ئەبێ چ کەڵکی لەوەدا هەبێ بەراستی نەگێررێتەوەر روون نەکرێتەوە ؟

هەر چۆنێك بێ وەك دەرئەکەوێ ئەم بیروباوەرانە پێش مەسەلەی (تحکیم) لەناو خەڵکەکەدا هەبووەو دەمەتەقێیان زۆر لەسەر کردووەو بیریان لێ‌کردۆتەوەو بەو توندوتیژی‌یەوە ئەو دەمە کاتی (تحکیم) سەری هەڵداو تەقیەوە . نیشانەی ئەمەش ئەوەیە ئەوانەی کە عثمانیان کوشت لەناو ریزەکانی (شراة) داهەبوون‌و هەندێکیان زۆر بە شانازی‌یە وەدانی بەوەدا ئەنا کە بەشداری کوشتنی عثمانی کردووە .

مسعدی کوری فدکی لەناو کۆمەڵێك لەو قورئان خوێنانەی دوایی بوونە (شراة) بەعلی‌وت : ئەگەر بانگیان کردی بۆ ئەوە بچیت وەڵامی نووسراوی خوای گەورەو شکۆمەند بدەیتەوە ئەبێ بچیت ، خۆ ئەگەر نەت‌کرد بە دەردەکەی کوری عەفانت ئەبەین . فلهاوزنیش لەنووسینەکەیدا ئەڵێ : ئەوانە واتە (شراة) شانازیان بەوەوە ئەکرد کە یەکەم کاری شۆرشگێریان کوشتنی عثمان‌بوو .

جا ئەگەر بێتو سەرنجی ئەوە بدەین کاتی کە (شراة) عبد اللە‌ی کوری خوبابیان بانگ کرد کە یەکێك بوو لە صحابەکانی پێغەمبەر (د . خ) ولێیان پرسی بەرهەمبەر خەلافەتی عثمان‌و علی رات چیە ؟ کاتێ کە وەڵامێکی ئەوتۆی نەدانەوە کە لەگەڵ باوەری ئەواندا بگونجێ عبد اللە‌یان کوشت‌و ژنەکەیان سەربری ، ئەو دەمە بۆچوونی ئەم (شراة)انەمان دەربارەی خەلافەتی عثمان بۆ روون ئەبێتەوە . بەمەدا دەرئەکەوێ ئەگەر (شراة) چەوتیەکیان لە خەلافەتی ئەبوبەکرو عمریشدا بەدی بکردایە هیچ دەربەست نەبوول کە بیخەنە روو دەری‌برن[٦٠] .

بەڵام دیارە کە خەلافەتەکانیان بەراست زانیوەو بەتایبەتی لەبەر ئەوەش کە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە بەریان کەوتووەو بەڵام هی ئەوانەی دوای ئەمانەیان بەراست نەزانیوە ئەوەبوو کاتێ کە ئەنجامی (تحکیم) دەرکەوت‌و گیروگرفت پەیدابوو علی داوای لێکردن بچن شەڕ لەگەڵ معاویەدا بکەن ئەمان نەچوون‌و بەگوێی علی‌یان نەکرد .

ئیبن ئەثیر ئەڵێ : علی نامەیەکی بۆ زیدی کوری حصین‌و عبد – اللەی کوری وهب الراسبی نووسیوە ئەڵێ : ئەنجام ، ئەم دوو پیاوەی کە بە ئارەزووی خۆیان بە پێچەوانەی قورئانی خواو بێ گوێدانە فەرموودەی خوا جووڵانەوە ناوبژیان کرد ، واتە بێ‌ڕێ‌وشوێن و بێ ئەوەی بە پێی قورئان (تحکیم) بکەن ڕەفتاریان کرد . . ئەم نامەیەتان کە کەوتە دەست وەرن بۆ لامان ، هەموومان بەرەورووی دوژمنەکانتان‌و دوژمنەکانمان ئەچین‌و مەبەستم لەمە ئەو کارەی پێشووە کە ئەمانویست بیکەین والسلام .

بەڵام ئەوان بەپیر ئەم خواستەی علی‌یەوە نەچوون‌و ئەم وەڵامەیان دایەوە : ب ناوی خرای بەخشندەو میهربانەوە . . لە ئیامی موسوڵیالەکانەوە عبد اللەی کوری وەهەبی الراسبی‌و زەیدی کوری حصین و ئەو موسوڵیانانەی کە لەگەڵیانداندن بۆ علی کوری ئەبی طالب کە خۆی لەخەلافەت خست ، سلاو لەوەی کە ڕێگەی چاکەی گرت‌و لە خراپەکاری دوورکەوتەوە ، دوایی ئێمە سووپاسی ئەو خوایە ئەکەین کە لەو زیاتر هیچ خوایەکی تر نیەو نووحینەکەتمان پی‌گەیشت‌و تیایا نووسیوتانە کە حەکەمەکان گوێیان نەیاوەتە قورئان‌و لەسەر ڕێ‌ی‌و شوێنی ئەو لەرۆیشتوون کە خوانا ناردوویەتی‌یە خوارێ ڕێکەوتوون ، سووپاسی بۆ ئەو خوایە کە زوو زانیمان لەم پ ڕ تا ئەو پەر ئیشەکەیان چەوتەو تۆش لە گەڵیانا بەم (تحکیم) بەحەند کردنەت گەورەترین هەڵەت کردووە کە زۆر لە هەڵەکانی ئەوان زیاترە . ئەشڵێ‌ی ئەگەرێیتەوە سەر ڕێگەی ڕاست‌و شادمانی خۆت دەرة بری بۆ گەڕانەوە بۆ سەرکاری پێشورت ، ئەگەر هات‌و تۆبەت کردو پەشیمان بوویتەوەو ء ەر تۆبەو پەشیمان بوونەوەکەشت ڕاست‌و بی‌گرێ بوون ئەوا ئێمە پەسەندی ئەکەین‌و تۆش وەکو موسوڵیانەکان گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی‌و (د . خ) ئیامی موسوڵیانەکان عبد اللەی کوری وەهەبی راسبی بە ، ئێمە دوهی ئەوەی کە تۆمان لە خەلافەت خست‌و لەبەر ئەوەش کە برواماں بەوە هەبوو مافی ئەوەمان هەیە لە خەلافەتت بخەین دەنگمان بۆ عبد اللەی کوری وهبی الراسبی داو کردمان بە خەلیفەو لەوەش زیاتر نەمانەتوانی هیچی تر بکەین ئیتر کۆتایی والسلام[٦١]

شهرستانی یاخی بوونیان لەسەر خەلاعەت لەو ڕایەیان جیائەکاتەوە کە بەرامبەر بە خەلافەت بوویانەو ئەکاتەوەو وای دەرئەخات سەرنجیان بەرامبەر خەلافەت ئەوە بووە باوەڕیان نەبووە بەوەی کە خەلافەت ئەبێ هەر لە قورەیشی‌یەکال بێت‌و ء م بیروڕایەشیان پێش مەسەلەی (تحکیم) کەوتووەو ئەم بۆ چوونەی شهرستانیش پێویست بە لێکۆڵینەوە ناکات چونکە روون‌و ئاشکرا ئەڵێ : (یاخی بوونیان لەسەرەتاوە لەسەر دوو کار بوو . . یەکەمیان ئەو ڕایەیان بوو بەرامبەر بە خەلافەت‌و ڕێ‌ی بوونی خەلافەتیان دا بەڵام مەرج نیە کە خەلیفە ئەبێ هەر لە قورەیشی‌یەکان بێ . . ڕای دووەمیان دەربارەی ئەوەبوو کە (تحکیم) ئادەمیزاد کردوویەتی نەك بخوا»[٦٢] .

ئەم یاخی بوونەشیان دووبارە ئەوە روون‌ئەکاتەوە کەپێش مەسەلەی (تحکیم) بە علی قایل بوون‌و ئەمەش لەبەر ئەوەتا علی قورەیشی بووە بگرە لەبەر ئەوە ئەوەبوو علی تواناو لیهاتووی ئیامەت بوو . . ئەمەش را دەری‌ئەخات علی پێش مەسەلەی (تحکیم) شایەنی خەلافەت بووە بەڵام کە پێچەرانەی مەبەستی ئەوان جووڵایەوەو (تحکیم)ی پەسەند کرد بە کافریان‌دانا .

وشەی (شراة) کە دوژمنەکالیان ناویان نابوون (خوارج) بەسەر ئەو کەسانەدا ئەسەپێنرێ کە لە ڕێ‌ڕەوی ملکەچ بوون بۆ دەسەڵاتی دەوڵ ت لایانداوە . . شهرستانیش (شراة) خوارج وا دائەنێ و ئەڵێ :[٦٣] ئەوانەی ملکەچی ئەو خەلیفەیە نەبوون کە خەڵکە کە لەسەری ڕێکەوتبوون پێیان ئەڵێن خوارج‌و ئەمانەش هەموو ئەوانە ئەگرێتەوە کە سەردەمی ئیامەکانی ڕاشدین لایان دابێ یاخود ڕۆژانی ئەوانەی کە دوای ئەوان هاتوون لایاندەوە .

ئیبن ئەثیر وشەی خەوارج (شراة) بەحەر ئەوانەدا ئەسەپێنێ کە پێش خەلافەتی علی ملکەچی دەسەڵاتی دەوڵەت نەبوون وسەردەمی علی‌یش بەوکەسانە ئەڵێن کە لە علی یاخی‌بوون .

شهرستانی پێش جەنگی صفین سەبارەت بە دەرکەوتنیان ئەڵێ : «ئەوانە ئەوکەسانەبوون کە ملکەچی عثمان نەبوون و چل‌و نۆ شەو گەکارۆیاندا تاکوشتیان) سەردەمی علی‌و معاویە ئەمانە پەرەیان سەندو. وتیان : «لەنێوان ئێمەو ئێوەدا قورئانی خوای گەورە هەیەو حوکم دان هەر بۆ خوایە – هەروەك چۆن ملکەچی عثمان نەبوون – لە علی‌یش وا یاخی بوون – کە ابو موسای ئەشعەری‌و عمروی کوری عاص (تحکیم)یان تەواو کرد ئەمانە ئەوەیان بە خەوشێ زانی‌و وتیان «حوکمدان هەر بۆ

خوایه» .

دوکتور شوقی ضیف ئەم رایە پەسەند ناکات و ئەڵێ : ئەوەی شوێن رووداوەکان بکەوێ لە کوشتنی عثماندا تێبینی پارتی (شراة) خەوارج ئەکاتو ئەوانەش ئەو کەسانەبوون کە لە عیراق لێی هەڵسانو بەشداری کوشتنەکەیان کردو ئەم کارەش ئەتوانرێ بە سەرەتای درووستبوونی ئەم پارتە وبەیەکەم بەردی بناغەی دابنێین و ئەم دیوارەش دوای کوشتنی عثمانو لایەنگرتنی علی کوری ئەبی طالب زۆر چینی لێ بەرزکرایەوە . هەر کەدیان علی ح کەمی پەسەندکرد چۆن لەوەوپێش دژی عثمان راستبوونەوەو بەکافریان دانا دژی علی یخ واراستبوونەوەو بە کافریان داناو لەم کارەشیاندا دەستیان بەو ئایەتەوە گرتبوو کە ئەفەرموێ (فقاتلوا التی تبغی حتی تفیءَ الی امر الله) ، (ومن لم یحکم بما أنزل الله فأولئك هم الکافرون) وتیان (حوکم کردن هەر بۆ خوایە) . لەوەشدا کە دەوڵەتو ئاین هەردووکیان بۆ لای خوا ئەگەرێنەوە لە علی دوورکەوتنەوەو چوونە حروراى نزیك کوفەوەو ئەمەشیان لەو کارەوە هاتبوو چۆن پێغەمبەر (د . خ) مەکەی بەجێ هێشت [٦٤] ئەمانیش لەو کۆمەڵە یوور کەوتنەوە کە لەرێی راست لایاندابوو . بەڵام لادانەکەیان لە علی وادیارە لەوەوپێش پێش دەرکەوتنی ەەنجامەکانی (تحکیم) ئەم شتانەیان چاوەروان کردووە .

هەرچۆنی بێ ئەوانەی دوای جەنگی صفین لە علی جیابوونەوە بە (شراة) ناسران ، دوکتۆرە سهیر القلماوی لەم رووەوە ئەڵێ : خەوارج (شراة) ئەوانەن کە جیاوازییان بە تەواوی لە نێوان موسوڵمانەکانو ئیمهمەکاندا پەیدا کردو بەرا کبەر موسوڵمانێتی تەواو سەرگ م بوونو بەرامبەر ئیمامەکان ساردبوونو ئەوەشی پێش دەرکەرتنی شیعە موسوڵمان بوایەو ئیمانی بە مەسەلەی پەسەندکردنی (تحکیم)ی علی بهێنایە بە شیعە لە قەڵەم نەئەدراو لەو باوەرەشەوە کە بەرامبەر بە ئیمامەت هەیانبووە کە ئەویش ئەو سەربەستیی یە بۆ هەڵبژاردنی ئیکام بە خۆیال داوەو لەبەر ئەوەش کە باوەری تەواویان بە ئاینی موسوڵمان هەبوو بەلادەر لەرێی ئاینی ناژمێردرێن .

رەنگە ئەورایەی کە بەرامبەر بە خەلافەت هەیانبوو ئەو رایەی کە ئیمامەت نابێ لە قورەیشی یەکان بێت ئەم رایەیان دەرکەوتووترینو کاریگەرترینو مەترسیدارترین شتی ئەو باوەرەیان بوو بێ کە هەیانبووە ، ئەم رایەشیان کە هەبووە وەنەبێ لە نێو موسوڵمانەکاندا شتێکی تازەبووبێ ، دوابی کۆچی دوابی پێغەمبەر (د . خ) کە سعد کری عبادەیان هەڵبژارد یەکەم کەس بوون کە ئەم رایەیەن هەبوو [٦٥] .

ئەوەشی لەرووی زانیارییەوە (شراة) بۆی چووبن ئاشکراو دیارە ئەویخ ئەوەیە خەلیفەیەکی قورەیشیان نەدیوە کە لە هەڵەوە دووربێو رەفتار بە پێی قورئانو رێوشوێنی پێغەمبەر (د.خ) بکات . لەم خەلیفانەش یەزیدی کوری معاویەو وەلیدی کوری یەزید بوون . جا لەبەر ئەوەی تازەکردنەوەی هەڵە شتێکی راست نەبوو ئەبوایە خەلیفەیەکی ئەوتۆ هەڵبژێردرێ کە توانای هەبێو باوەری بەراستیو دادەوەری هەبێو ئەم خەلیفەیەش خرای ئەکرد کوێلە یان سەربەست یان نەبەطی یاخود قورەیش ئەبوو ، ملکەچ بوونیشیان بەرامبەر بەو خەلیفەیە بەسترابوو بە م سەلەی ئاینو کۆمەڵێکەوە کە فرمانیال بە چاکە کردنو خراپە نەکردنە (الأمر بالمعروف والنهی عن المنکر) . ئەو کۆمەڵە کە لەگەڵ خەلیفەی دادوەرو راستدا لەسەری پێویستە شەر دژی دوژمنی سەرپێچی کاربکەن ئەگەر هاتوو خەلیفە هەڵەی کردو لەرێی راست لایدا دووبارە پێویستە لەسەریان خەری لەگەڵدا بکەنو نەیهێڵن .

(شراة) لە روی زانیارییانەوە ، لەرەخنە گرتندا گەیشتبوونە پلەی گێرەشێوێنیو ئەم لایەنەش گەلێ رووداوی جۆراوجۆر دەریان خستووە . تەماشا ئەکەین بەرامبەر ئەبربەکرو عمر بە پێی قورئانو رێبازی پێغەمبەر (د . خ) جوولاونەتەوەو لەگەڵ عثماندا کە تاشەش سالی خەلافەتی چاك بوو لەگەڵیا بوونو کەدیان بە پێچەوانەی قورئانو رێبازی پێغەمبەر (د.خ) ناجوڵێتەوە بە کافریان داناو راستبوونەوە شەر لە گەلا کردنو کوشتنی عثمانیان بەلاوە شتێکی رەواو راستبوو ، رێرەوی علی یشیان تاکۆتابی هاتنی جەنگی صفین بەلاوە باشبوو لەم ماوەیەدا لایان نموونەی خەلیفەیەکی چاكبوو . . هەر لەبەر ئەمەش بوو کاتێ کە طلحەو زبیر لە علی لایاندا (شراة) ئەم دوانەیان بە کافرداناو کوشتنی ئەوانیان بە پێویست زانیو ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە لە رێ رەوی ئیمامێکی دادوەرو رێگای راست لایانداوە . بەم گیانەوە (شراة) شانبەشانی علی دژی پاشگەزبووەکان جەنگان و تا مەسەلەی (تحکیم) لەگەڵیابوون کە رێکەوتنەکەی پەسەند کرد لایان وابوو کفری کردووەو ئەبێ دژی بوەستن . راشیان بەرامبەر بە معاویە وابوو کە خەلافەتی بەزۆر بچربووەو دژی خەلیفەی راستەقینە جەنگاوەو ئەمە خرابەیەکی زۆر گەورەیەو کافرەو ئەبێ شەری لەگەڵدا بکرێ . هەروەها سەرنجیشیان وابوو ئەو کەسانەی کە شوێن خەلیفەیەکی کافر کەوتبن ئەوانیش هەر کافرنو خەلیفە کافرەکان بەم پێیە

موسولمانەکانیان بە رێی کفردا بردووەو خوێنی هەموو ئەوانەی
کە لەگەڵ ئەو خەلیفە کافرانەدا بوون بەلایانەوە مفت‌بوو ، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کەخەلافەت ئەبێ پڕ بە پێستی ئەوەبێ کە خۆیانی بۆ ئەپالاوتن‌و ئەبێ ئەو مەرجە بایەخدارا نەشیان تێدابێ کە پێویستە خەلیفەیەکی موسولمانی راست هەیبێ‌و ئەم کارەشیان بووە هۆی پەیدابوونی جیاوازی لەناو موسولمانەکانداو ناکۆکی بهێنێتە کایەوەو موسولمانەکان بکات بە چەند بەشێکەوەو وایان لێ‌بکات جارێك ، بە شمشێر شەربکەن و جارێك بە زمان .

ئەگەر بهاتایە بمانزانیایە سوننەو شیعەکان بۆ بەرگری کردن لەو بیروباوەڕانەی هەیانە چییان نووسیوەو وەڵامی ئەوانیان پێ‌داوەتەوە شتێکی گەلێ باش بوو بەڵام تاوەکو ئیستە لەم بارەیەوە نووسین سەبارەت (شراة) کەمەو پێویستمان گەلێك بە نووسینەکانی ئەو دەستانەی تر هەیە تاوەکو ئەو زانینانەی کە هەن بەراستی‌و باشی بلاو بکرێنەوە و رەنگیشە تا ئیستا گێرانەوەیەك دەربارەی دروست بوونی (شراة) لە نووسینەکەی (براوی) زیاتر نەبێ پشتی پێ ببەسترێ کە ساڵی ١٣٠٢ زاین نووسیویێتی .

کارەکە بەو جۆرەبێ کە لێ‌ی دواین چاپ کردنەوەی نووسراوی ناوبراوو نووسراوی تری لەر جۆرە کە باسی دروست بوونی (شراة) و مێژووەکەیان ئەکەن دەست‌کەوتن لە چاپ بدرێن ئەوە کارێکی گەلێ باش‌و سوودبەخشە . ئەوەشی کە ئەم ئەرکەی خستە سەرشانی خۆی و رای‌پەراند محمد کفافی بوو لەو نووسینەیدا کە بە ناوی (الکشف والبیان)ی ابی سعید محمد کوری سعیدی ئەزدی فلهاتی (فلهات یەکێکە لە شارەکانی عمان) پێ‌ناسین . لەم نووسینەدا کە بە ئینگلیزی لە گۆڤاری (خطوط جولیان الجامعة التونسیة ژمارە (٢٣٦)[٦٦] بلاوی کردۆتەوە بەکورتی ئەوەی کۆڵیوەتەوەو شی‌کردۆتەوە کە چۆن (شراة) دروست بوو لە نێوان ئەوان و علی کوری ئەبی طالبدا لە کوشتاردا چی‌روویداوە .

ئەوەی کە شایانی باس بێ ئەوەیە ابو سعید محمدی کوری سعیدی ئەزدی فلهاتی کە نووسەرە کە بە لە زۆر وەرگێڕراوادا ناوی نەهاتووەو دایەرەی مەعاریفی ئیسلامیش ئەڵێ : ئەو گێڕراوانەی پەیوەندیان بە (شراة)ەوە هەیەو بە درووست بوونیانەوە لە دوو سەرچاوەوە بەدوورو درێژی باس کراون ، یەکەمیان (الجواهری) (برادی)یە کە سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچی نووسرهوەو دووەمیان (الکشف والبیان)ی فلهاتی‌یە کە نووسەرەکەی سەردەمی میرنشینی عمان کە ئەو دەمە بە پێ‌ی خۆی دەسەلاتیان بووە . . واتە سەردەمی سولتانی کوری سیف‌ی کوری مالکی یعقوبی ژیاوە .

نووسینەکەی ابو سعیدی فلهاتی بریتی‌یە لە پەنجا بەش‌و ئەم پەنجا بەشەش (علم الکلام)ەو بەشی یەکەمیان بریتی‌یە لە (٢٤) پارچەو باسەکەشی لەسەرەتادا مێژووی پێغەمبەرانەو بایەخی تایبەتی دانیشە بە پێغەمبەرایەتی (محمد . د . خ) (البعثة المحمدیة)و مێژووی خەلیفەکانیشی تێدایە تا ئەو دەمەی بەتەواوی کار ئەکەوێتە دەست ئەمەوی‌یەکان ، هەروەها بایەخێکی تەواویشی بە خەلافەتی عثمان‌و ئەورووداوانە داوە کە لەو سەردەم دا بوون و سەریان هەڵداوەو هۆی کوشتنی عثمانیش باس ئەکات بەڵام ئەم بەلای خۆیەوە ئەو کوشتنەی بەکارێکی رەوا نەزانیوە ، پێنج بەشی واتە لە (١٨)وە تا (٢٢)ی بۆ خەلافەتی علی‌و کاری گێرەشێوێنی ئەو سەردەمە تەرخان کراون‌و دەربارەی درووست بوونی (شراة) ئەدوێ‌و بەرگری لە بۆچوونەکانیان ئەکات‌و ئینجا ئەچێتە سەر باسی (شراة)و عبد - اللّه‌ی کوری عباس کە رای (شراة)ی بەراست زانیوەو (ئەگەرچی وەك نووسەرەکە ئەڵێ بەراستی زانیون بەڵام شوێنیان نەکەوت) ، لقەکەی تریشیان (٢٦) بەشە باسی ئەو دەستانەی کردووە کە ناموسولمان بوون دوابی هاتۆتە حەردەستەکانی موسولمانان‌و روون کردنەوەی وتار ووڵامدانەوەی بەرامبەرەکانیان‌و ئەمەش بە پێ‌ی ئەو حەدیسە رایپەراندووە کە دابەش بوونی موسولمانەکانە بە حەفتاو سێ دەستەو بەرای ئەو لەم دەستانە تەنیا ئەباضیە نەبێ کەراست بووە ئەوانی تر هەموو لە ئاینی موسولمان لایانداوە .

ئێمە هەندێ مێژوو نووسی (شراة) ئەهێنینەوە تاوەکو ئەو بیرو باوەڕەی کە (شراة) بوویەتی بزانین چیە ، لەم رووەوە ابو سعید فلهاتی کە مێژوونووسی (شراة)ە ئەڵێ : لەبەرئەوە (شراة) نارەزابی خۆیان بەرامبەر بە علی دەربری چونکە علی بە نهێنی نامەی بۆ معاویە نووسیوەو لەسەر خواستی معاویە ناوی میری موسلمانانی لەسەر خۆی لابردووەو ئەم قسەیەش بە (شراة)ەکان کە نووسەر ناویان بە موسلمانەکان ئەبات) گەیشتۆتەوەو بە علی‌یان وت : چی‌پاڵی پێوەنای ئەو ناوەی کە موسولمانەکان لێیان نابووی لە خۆتی داماڵی ، تۆ میری موسولمانان بوویت‌و معاویەش میری کافران‌بوو ، تۆبە لەو کارە بکە کە کردووتە ، علی تۆبەی کرد ، بەڵام معاویە بۆ حەکەمی‌یەکەی هەردوو حەکەمە کە بە دزی‌یەوە نامەیەك بۆ علی ئەنێرێ‌و هەرچیەك دەستەی معاویە داوهیان کرد علی پێ‌ی قایل بوو تەنهەت علی ئەوەشی پەسەند کرد کە ئەبو موسای ئەشعەری بەدەم راستی خۆی هەڵبژێرێ‌و معاویەش عمروی کوری عاص هەڵبژێرێ ، ئەو عمرویەی کە

پێش ئەوەی بێتە موسوڵمان دوژمنی پێغەمبەر بوو (د.خ) بە نەووەد دێڕ شیعر سەرزەنشتی پێغەمبەری کردو پێغەمبەر (د.خ) فەرموو بووی (خوایە خۆ من شیعر نازانم و ناشمەوێ فێری بم بەلأم بەرامبەر هەموو دێڕێکی.ئەو شیعرانە لەعنەتێکی خوای لێ بدات) .

هەروەها ئەبو سعیدی فلهاتی ئەڵێ : علی بەناوبژی‌کردنەکە قایل بوو وپشتی کردە حوکمی خواو قورئان ، جا ئەگەر (تحکیم)ەکە دادوەرانەو راست‌بوایە ئەوا علی لەوەوپێش مافی خۆی دۆڕاندبوو چونکە خوێنێکی زۆری رژاندبور . بەلأم معاویە لەبەر قەوەی خۆی داوای رێکەوتنی کردبوو لەراستی‌یەکەوە نزیکتربوو ، خۆ ئەگەر (تحکیم)ەکەش هەڵەو بێ سەرو شوێن بوایە ئەوا علی بەوەی کە چۆتە ناویەوە هەر ئەیدۆڕاندو لەهەردوو لاوە تووشی زیان ئەهات .

لەپێغەمبەر (د.خ) ئەگێرنەوە فەرموویەتی : دووحەکەمی لەرێی لادەر لە نەتەوەکەمدا پەیدا ئەبێ‌و هەر کەسێکیش شوێنیان بکەوێ لەرێ لائەدات ، لەلایەکی ترەوە ئەم نووسەرە ئەڵێ : ((عبد اللەی کوڕی عباس دوای ئەو دەمەتەقێ‌یانەی لەگەڵ (شراة)ەکاندا کردبوونی بیروباوەڕی (شراة) کاری تێ‌کردبوو و کاتێ کە گەڕایەوە لای علی ، علی هەر کە چاوی پێ‌ی کەوت بەرزەبێ لەبەری هەڵساو پێ‌ی وت ئەم قسانەی نێوان ئێمەو (شراة)کان با هەر خۆمان بیزانین‌و کەس نەیبیستێ‌و داوای لێ‌کرد ئەبێ یارمەتی بدات و شەر لەگەڵ (شراة) دا بکات . . بەلأم کوڕی عباس وتی : نە بە خوا . . من شەر لەگەڵ کۆمەڵێکدا ناکەم لەم دنیایەدا دوژمنایەتیان کردم‌و لەوەو دنیاش دوژمنترم ئەبن‌و بەرامبەرم بەهێزتر ئەبن ، ئەگەر لەگەڵیان بم لای سەرووپەین ناکەوم .

کوڕی عباس لە علی جیابووەوەو بەجێ‌ی هێشت‌و علی‌یش دوای نامەیەکی بۆ نووسی‌و لەنامەکەیدا سەرزەنشتی ئەوەی ئەکات کە پارەی لە دارای دەوڵەت (بیت المال) بردووە ، ئەویش وەلأمی ئەداتەوە ئەڵێ : بەڵێ من پارەم بردووە بەلأم ئەو پارەیەی بردوومە زۆر کەمترە لەو مهەی کە ئەمکەوێ ، هەر کەسێکیش مافێکی بووبێ داوەمەتێ ، خۆ ئەگەر ئەو پارەیەشم بە نارەوای بردبێ پێم چاکترە لەوەی بەشداری رشتنی خوێنی موسوڵمانان بکەم .[٦٦]

هەروەها ئەبو سعید فلهاتی پەنجەی بۆ ئەو شوێنەی نەهرەوان راکێشاوە کە شەری تێدا بەرپابوو ، علی ئەودەکە چوار هەزار کەسی لە (شراة) کوشتووەو لەو چوهر هەزار کەس حەفتایان ئەوانە بوون کە لە (بدر) شەریان کردوو چوار سەد کەسیشیان لەوانەبوون کە لە دەوروپشتی پێغەمبەر بوون *(د.خ) ، ناوچەوان‌و ئەژنۆیان لەبەر زۆر نوێژکردن وەك پێستی ئەژلۆی حوشتر لووس بووبوو ، ئەکانەش بریتی‌بوون لە مهاجرو ئەنصارو ئەوانەی دەوروپشتیال‌و ئەوانەشی کوژران وەك لەوەوپێش لێ‌یان دواین حرقوصی کوری زهیرو ئەبو کعب بوو کە لەوەڵ هەندێ لەکەس‌وکاریاندا لەو شەرەدا گوژران‌و (ئومەیلە)کە یەکێ‌بوو لە صەحابەکانی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ حەفتاکە سەکەدا کوژراو ئەوانی کەشیان مهاجرو ئەنصار بوون .

علی کە لەنەهرەوان شەری لەگەڵ (شراة)ەکان کردو دوای لەکوشتاریان پەشیمان بووەوەو لە جیاتی ئەوەی شەرەکە رانەگرێ پەشیمانی خۆی بۆ دەربرین‌و وتی : ئای کە شتێکی خراپمان کرد ، پیاوە باش‌و زاناکانمان لەناوبرد . ئەیگێرنەوە هەندێك لەوانەی لەگەڵیا بوون پێیەن وتووە (ئەی میری موسڵمانان ئێمە شەرمان لەوەڵ کافران کرد ، وتی کافر کامانەن ، وتیان گێچەڵ خەرەوەکان ، علی‌وتی گێچەڵ خەرەوەکان ناوی خوا ناهێنن بەلأم ئەوانە خوایان زۆر لەبیرە .[٦٧]

دوای ئەوانەی کە لەگەڵیا رێك‌نەکەوتن بەجێ‌یان هێشت‌و هەندێکیشیان گومانیان پەیدا کردوو هەندێکیان بەراستیان زانی‌و تۆبەیان کردوو هەندێکی تریشیان ناوبژی کردنەکەی بەراست دای قەڵەم‌و هەندێکی تریان ناوبژی کردنەکەی بە چەوت زانی . .هتد .

بەم جۆرە ئیمامی علی خەڵکێکی زۆری لێ دوورکەوتەوەو شەش ساڵ خەلافەتی کرد) .[٦٨]

محمد رضا حسن دجیلی پایە بنەرەتی‌یەکانی (شراة)و دەستەکانیان کە میرەکانیان لێ‌جیابوونەتەوە وا ئەبینێ کە ئەمە ئەنجامی ئەو رایانەبوو کە بەرامبەر ئاین بوویانە و باوەریان وابووە تەنیا ئەمان بوون بە خواو پێغەمبەرو (د.خ) ئاین بەس نیەو ئەبێ پەندوەر گرتن لەچاکەر خراپەدا هەبێ ، لەبەر ئەوە وایان لەقەڵەم داوە ئەگەر هات‌و یەکێ کارێکی نارەواو گەورە بکات ئەرە کافرە . . بە پێ‌ی ئەم قسەیە (شراة)ەکەن لەگەڵ رەی *المرجئە) دانین کە لەگەڵ رای کاربەدەستانی ئەوسای دەوڵەتدا ئەگونجاو پێش هەکوو شتێك‌و دوای هەموو شتێ بایەخ هەر بە ئاین ئەدات‌و ئەمەش کارەکانی هەندێ خەلیفەی ئەمەوی وەکو یەزیدی کوری معاویەو وەلیدی کوری یەزید بەڵگەن بۆ ئەوەیکە پێچەوانەی قورئانی پیرۆزو رێ‌رەوی پێغەمبەر (د؛خ) بوون . (شراة)ەکان لە کارەکانی ئەم خەلیفانەدا جۆرە داوێن

پیسی‌یەك ڕەچاو ئەكەن كە لە ئاینی موسوڵمانانندا جیٚ‌ی نابێتەوە) . [٦٩]

دوكتور زكی نجیب محمود لە نووسینەكەیدا بۆ ئەوە ئەچێت كە جەنگی صفین هۆی دەركەوتنی حزبی (شراة)و یەكەم هۆی سەرنەكیش بووە بۆ دەركەوتنی ئەم حزبە و باسی ئەوە ئەكات كە كاتی ڕێكەوتن و كوشتارو شڕو راوەستانو ئەو وتارانەی كەدراونو ئەو ڕێكەوتنەی لە نێوان علی‌و سەربازەكانی‌دا چی‌ی روویداوەو ئەشلێ پاش بەرزكردنەوەی قورئان لەكاتی گەرمی بزوتنەوەو شێواندندا لە هەموو لایەكەوە دەنگی سەربازان بەرز ئەبووەوە داوای ناوبژیان ئەكردو وعلی‌یش وتاری بۆ خەڵكەكە بۆ ئەوە ئەخوێندەوە كە بێنەوە هۆش خۆیان[٧٠] (ئەی خەڵكینە من لەگەڵ ئەو كارەدام كە بە پی‌ی قورئان بەڕێوە ئەچی بەلاّم معاویە عمروی كری عاص‌و ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون‌و لەگەڵیاندان نە لایەنگیری ئاینن‌و نە بە پی‌ی قورئان ڕەفتار ئەكەن من خۆم چاكیان ئەناسم‌و ، ئێوەش تیاتانا هەیە كە لە گەڵیاندا بوون‌و گەورەو بچووكتان ئەوە ئەزانی كە ئەمانە بە منداڵی خراپترین منداڵ بوون‌و بەگەورەییش خراپترین پیاوبوون‌و قورئان راستەو ئەوانە ئەیانەوی پووچی بكەن‌و بۆ ئەوەش بەرزیان كردەوە مەبەستیان ئەوەیە لە خشت تان بەرن‌و فێڵتان لی‌بكەن . تەنیا هەرە بۆ تاكە سەعاتێك هۆش‌و بازووی خۆتانم پی‌بدەن‌و هێندەی نەماوە كەراستی سەربكەوی‌و هەموو شتی روون‌بێتەوە . .هتد) بیست هەزار لایەنگیر لەوانەی كە خۆیان لە ئاسنەوە پێچابوو شمشێرەكانیان لابووە سەرشانیان لەبەر نوێژكردنی زور ناوچەوەنیان ساف بووبوو هاتن ، ئەمانەش ئەوانەبوون كە دوای بوونە (شراة)و علی‌یان هەر بە ناوی علی بانگ ئەكردوو میری موسولمانانیان لەسەر لابریو وتیان : علی وەلاّم بدەرەوە ! (علی ناچاربوو وەلاّمی دان ڕەو نووسینەكەش كە شایەتەكان شایەتیان تێدا دابوو بۆ خەڵكی شام خوێنرایەوە) . خەڵكی شام پی‌ی قایلبوو ، بەلاّم كە بۆ لایەنگیرانی علی خوێنرایەوە هەندێك لاویان هاواریان كرد (حوكمدان هەر بۆ خوای ) . هێندەی نەخایان ئەم قسەیە لە هەموو لایەكەوە ئەكراو كە سی نەمایەوە لە لایەنگیرانی علی هاوار نەكات‌و نەلێ (حوكمدان هەر بۆ خوایە) و ئێمەی مرۆڤ لەئاینی خوا جیا نابینەوەو بریارمان پی‌نادری‌و بریار دەرنین خوا هەر خۆی بریار ئەدات‌و بریار دان هەر بۆ ئەوەو هەر ئەویشە كە باشترین بریاردەربێ) .

علی لە سەرەتادا وای زانی ئەوانەی كە وتیان (حكم هەر بۆ خوایە) كەمن لەبەر ئەوە بایەخی پی نەدان بەلاّم كاتی كە گوی‌ی لەدەنگ بوو لە هەموو لایەكەوە دی‌و ئەلێت : علی حوكم بۆ تۆ نیەو حوكم هەر بۆ خوایەو خرا حوكمی خۆی بەحەر معاویەو لایەنگیرەكانیا وا داوە یا ئەبی بكوژرێن یاخود ئەبێت بێنە ژێر دەسەلاّتمانەوە ، ئێمە هەڵخلیسكاین‌و هەڵەی خۆمان بۆ دەركەوت‌و گەڕاینەوەو تۆبەمان كرد ، توش بگەڕێوە لای خواو تۆبە بكە ، خۆ ئەگەر ئەمانەش نەكەیت ئەوا ئێمە لە خۆمانت بی‌بەری ء كەین .

علی وتی : دوای قایل بوون‌و پەیمەن‌و . پەشیمان بوونەوەكەی ەەبێ ؟ ئەمانەش ئەوانەبوون كە دوای ئەم مەسەلەیە خۆیان ناونا (شراة)و دوژمنەكانیشیان پێیان ئەوتن (خوارج) . ئەم ناوەشیان بۆیە لە خۆیان نا واتە خۆیان كڕیوە بۆ ەەوەی بیكەن بە قوربانی لەری‌ی خواداو هەر كە ئەنجامی (تحكیم) دیاری‌دا نارەزایی خۆیان دژی دەربری‌و بوونە تەیارێكی سیاسی‌و حزبێك دوای لێ زوری لی‌بووەوە . [٧١]

بایەخدارترین بیروباوەریان ئەوەبوو (حكم هەر بۆ خوایە) بۆ خاوەن توانایەوە پشتاو پشت بۆ هاتە خوارەوە نیەر بۆ خاوەنی هێزە (نەك بۆ كەسێكی دەوڵەمەند كەلینێك نابی لە نێوان رەفتاركردن‌و (ئاینداً) بیروباوەردا هەبێت‌و لە یەكیان جیابكاتەوەو مرۆڤێك ئەگەر هاتو ئیمانی بە باوەرێك هێناو تی‌ی گەیی باشەو پەسەندی كرد بۆ وەدیهێنانی ئەو بیروباوەرە ئەبێت گیانی خوی بەخشی .

ئەمە لە لەیەك ، لە لایەكی تر دوكتور ناجی حسن ئەچی بۆ ئەوەی كە خەلافەتی عثمان‌و ئەو سیاسەتەی كەبوویەتی لە عاست ئەو ناوچانەی كە سەر بە ئاینی موسوڵمان بوون یەكەم هۆیە بۆ یاخی‌بوونی هۆزەكان‌و هەڵسانیان دژی كاربەدەستانی ناوەندی كە لە مەدینەدە بوون‌و ئەم كارە بووە هۆی لەدایك بوون‌و دەركەوتنی حزبی(شراة) .

هەستان‌و یاخی بوونی هۆزەكان‌و لە خەلافەت لادانیان[٧٢] نارەزای دەربرین بوو بەرامبەر بە كاربەدەستەنی مەدینەو ئەكەش بەزۆری لەسەردەمی خەلافەتی عثماندابوو باوەریان وابوو كە بەهاتنی علی بۆ خەلافەت‌و نەمانی عثمان ئەم شتە تایبەنكاریانەی كە هەر بۆ دانیشتوانی حجازبوو چاك ئەبی‌و ئەمانیش بەشداری تێدا ئەكەن‌و بەلاّك ئەوەبوو ئەو سیاسەتەی كە علی بەكاری هێنا بووە هوی وەدی نەهاتنی ئەم ئاواتەیان‌و ئەم خواستەشیان لەشەری «جمل»دا تەواو دەركەوت‌و داوایان لە علی كرد ئەو دەسكەوتانەی لە شەرەكەدە بووە بەشی ئەوانیشی لی‌بدات

کەچی علی‌یش زۆر بە توندی بەرامبەر ئەم خواستەیان راوەستاو بەگوێی نەکردن . ئەوانیش کە خەلافەتی علی‌یان بەم جۆرە بینی وایان هەست کرد دەوڵەتی تازە کە لە ئەمەوی‌یەکی وەکو (عثمان)ەوە ئەگەرچی کەوتە دەست قریشی‌یەك کە (علی)یە هەر هەمان دەوڵەتی قورەیشی‌یەو هیچی لێ نەگۆرراو بۆ دەرچوون دژی ئەو دەوڵەتە نوێیە جەنگی صفین‌یان بە هەلێکی گونجاوزانی ئەوانەش کە ئەمەیان کرد بەزۆری هۆزەکان تەمیم بوون کە فێر نەبووبوون بێ دەسکەوت مل‌کەچی هیچ دەوڵەتێ بن .

سەردەمی پێغەمبەر(د .خ) ئەم هۆزانە لەهەڵ دەوڵەتی مەدینەدا گیروگرفتی زوریان پەیدا کرد ، لە گێرانەوەیەکی عمران کوری حصین‌دا وتراوە کە کۆمەلێك لە دەم‌راستانی هۆزی تەمیم هاتوونە لای پێغەمبەر (د .خ) پێغەمبەر (د .خ) فەرمووی مژدانە بە بەنی تەمیم بدەن ، وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا مژدەت داینێ‌و مژدان کەمان بدەرێ ، لە گێرانەوەیەکی تردا (ئەگەر مژدانەمان ئەدەیتێ بماندەرێ) کە پیغەمبەر ئەمەیان لێ‌ئەبیستێ رەنگی ئەپەرێ .

موسەیلەمەی درۆزن پی‌ی ئەلێ : ئەوەی کە ویستت بۆمان کردی بەلاٌم مەرجمان ئەوەیە کە لەدوای خۆت ئەم کارە بۆ ئێمە بێ . (٧٣)

نووسینی (الخلفاء) کە لە لایەن نووسەرێکی نەزانراوەو نووسراوە باسی جەنگی صفین‌مان بە کورتی بۆ ئەگێرێتەوە بەتایبەتی ئەوە کە لە نێوان علی‌و لایەنگیرەکانیدا رووی‌داوەو علی چۆن چووە بۆ کوفەو لەوێ چاوەرێ ، ئەنجامی مەسەلەی (تحکیم)ی کردووەو لایەنگیرەکانی چۆن لی‌ی جیابوونەوە . .

دوای جەنگی صفین علی رووی کردە کرفەو(٧٤) لە شوێنێکدا لایدا کە پی‌ی ئەلێن (نخیلە) ، عبداللەی کوری ودیعەی ئەنصاری لە علی هاتە پێخی‌و علی لی‌ی پرسی : ئەوانەی کە خاوەنی(را)ن لە ناو خەلکیدا چی ئەلێن ؟ وتی : ئەلێن علی کۆمەلێکی زور گەورە خەلکی لی‌کۆبووبووەوە کەچی بلاٌوەی بەو خەلکە کردوو بەشێکی زور بەهێزی وێران کردو ئەبێ چۆن بتوانێ ئەوانەی کە بلاٌوەی پی‌کردن کۆیان بکاتەوەو ئەوەی وێرانی کرد درووستی بکاتەوە . ئەوانەی کە گوێ‌رایەلی علی بوون هەرچۆنێك بێ بکوژرانایە یام سەر بکەوتنایە شەرەکەیان بەلاو باشتربوو ئەبوایە علی شەری رانەگرتایە .

علی وتی : من (ئەو بەستەم وێران کرد یان ئەوان وێرانیان کرد ، من بلاٌوەم بەوان کرد یاخود ئەوان خۆیان بلاٌویان لی‌کرد ؟)

سەبارەت ئەو قسەیەی علی کە وتی :( من دنیام ئەوەندە بەتوندی نەگرتووەو بەخوا ئیستا مردنم بەلاوە باشترەو ئەم ویست شەر رانەگرم‌و هەلٌمەت بیەم بەلاٌم هەر کە تەماشای ئەم دوانەم (حسن‌و حسین) ئەکردە سەرنجی ئەم دوانەشم (محمد کوری حنیفەو عبداللەی کوری جعفر)ئەدا سلٌم لەوە کردەوە بکوژرێن‌و لەناوبچن‌و نەتەوی محمد (د .خ) . نەمێنێ‌و ئەمەش شتێکی ناخوشە . بەو خوایە ئەمجارە هەر شەرێ بکەم یەکی لەمانە لەگەلٌ خۆم نایەم . (٧٥)

علی کاتێ ئەیبینێ ئەوا هەندێ جار لە جەنگی (صفین)دا حسنی کوری بەشداری شەر ئەکات ئەلٌێ : بەخوا من ئەم دوانە بەکوشت ئەدەم . . . ئەم دوانەم لێ دوورخەنەوەو ئاگاتان لێیان بێ لەناو نەچن ، لەناو بچن وەچەی پێغەمبەر (د .)لەبن دێ . (٧٦)

ئەو کەسانەی کە بەرەو کوفە شوێن علی کەوتن بەدرێژایی رێگا شەرو جنێویان ئەکردوو بە قامچی لە یەکتریان ئەداو هەندێکیان بە هەندەکەی تریان ئەوت : کۆمەلٌەکەمانتان بلاٌوە پی‌کردو جیابوونەوەتان لەبەردمماندا داناو ئیمامەکەمانتان بەجی‌هێشت . لە (نخیلە)لی‌ی جیابوونەوەو لەگەلٌ علی نەچوونە کوفەو دوازدە هەزار سواریان لە (حرورا) دابەزین‌و بانگ‌دەرەکەیان دەنگی هەلٌبری‌و بلاٌوی کردەوە کە لە مەودرا میری جەنگ کردنیان شیت‌ی کوری ربعی‌یەو میری نوێژشیان عبداللەی کوری کواءە ، ئەم بلاٌوکردنەوەیەش دوای ئەو راوێژکردن‌و سەرکەوتنە دیموکراتیەبوو کە لایەنی خواگرتن‌و بەچاکەکردن‌و دوورکەوتنەوە لە خراپەو ئەم دوانە هەلبژێردران . (٧٧)

ئەگێرنەوە رۆژێك علی وتاری ئەدا یەکێك وتارەکەی پی‌بری‌و لای مزگەوتەکەوە هاواری کرد : (علی حوکم هەر بۆ خوایە)و علی‌یش وتی : ناوی خوا گەورەیە راست و خەلٌکیش ئەیانەوی پێچەوانە رەفتاری پێ بکەن ئەمانەش ئەگەر بێ‌دەنگ بوون ئەوا ئێمەش هیچ نالێین و ئەگەر بێ‌دەنگیش نەبوون ئەوا لەگەلٌیاندا ئەدوێین جا ئەگەر هات‌و دژمان وەستان ئەواشەریان لەگەلٌ ئەکەین .

یەزیدی کوری عاصم الرعازی راپەری‌و وتی : خوایە ئێمە لە تۆ زیاتر پەنا بۆ هیچ کەسێ نابەین . . بەهیچ جورێك نامانەوێ کەم‌و کورتی لە ئاینەکەماندا هەبێ‌و لەسەر قسەکەی رۆی‌و وتی : علی بۆچی تو ئەتەوێ بە کوشتن بمانترسێنی ؟ . گەلێ قسەی تری کرد تاوەکو علی وتی : ئێوە ئەگەر دوژمنی من

بوونایە یان من دوژمنی ئێوە بوومایە وا بەیەکەوە بۆئێرە نە ء هاتین‌و شوێنم نەئەکەوتن‌و ئەوەتا ڕێگەی مزگەوتیشمان لی‌نەگرتوون کە ناوی خوای تیا بهێڵن‌و شەڕیشمان ل گەڵ نەکەن شەڕتان لەگەڵ ناکەین .

کە ئەمەی وت گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی‌و دوو پیاوەکەش کۆڕەکەیان بەجی‌هێشت‌و هاتنە دەری .

دوکتور زکی نجیب محمود لایەك لەو ڕێکەوتنەی نێوان (شراة)و علی‌مان بۆ ئەگێڕێتەوە کە علی چۆن هەولی داوە کەوازیان لەو بیرە پی‌بێنی کەهەیانە علی پێش هەموو کەسی عبداللهی کوری عباس ئەنێری بۆ لایان‌و پی‌ی ئەلی : ( پەلە لە وەلأمدانەوەیان مەکە تا خۆم دێمە لاتان ، عبدالله بۆ ئەوەی لی‌یان بپرسی کە هەڵوێستیان چی‌هەیە بۆ چاوپی‌کەوتن بانگی کردن‌و ئەم دەمەتەقی‌یە هاتە کایەوە : (٧٨)

بۆچی ڕەقتان لەمیری موسڵمانان هەڵگرت ؟

(شراة) وتیان : موسڵمانان مێریکیان هەبوو لە ئاینی خوادا (تحکیم)ی ئادەمیزادی پەسند کردو بەمە لەڕێگەی ڕاست لایداو ئەبێ تۆبە بکات . ئەگەر دانی بەوەدا نا کە کفری کردووە ئەوا دێینەوە لای .

کوری عباس وتی : بۆ باوەڕهێنەرێك کە باوەڕەکەی گومانی لی ناکری نەهاتووە دان بەو دابنی کە کفری کردووە .

(شراة)ەکان وتیان : (تحکیم)ی پەسەند کرد .

کوری عباس وتی : خوا خۆی فرمانی (تحکیم)ی داوەو لەمەسەلەی (ڕا) دەربڕیندا فەرموویەتی (یحکم به ذو عدل منکم) باشە ئەم کارە کە لە (ڕاو)دا بکری لە ئیمامەتدا کە بۆ موسوڵمانان بۆتە گیروگرفتێکی گەورە بوچی نەکری ؟ (شراة)ەکان وتیان : حوکمی بەخەلافەت پی‌درا بەلأم ئەو نەیویست‌و پەسەندی نەکرد .

کوری عباس وتی : (تحکیم)وەك مەسەلەی ئیمامەت وایە . . چ کاتی ئیمامەتی ئیمامێك بەتاڵ‌بووەوە ئەبێ لی‌ی دوورکەونەوەو (حەکەمیش ئەگەر هات لایدا ئەوە قسەی هەر هیچ لی‌نابیستری .

علی بەم ناردنەی کوری عباس بۆ لای (شراة)ەکان دەستی هەڵنەگرت‌و خۆشی چووە لایان ، بە عبداللهی وت : هەی خوا چاکت بۆ بکات پێم نەوتی نەکەی لەم بارەیەوە قسەیان لەگەڵ بکەیت .

علی ڕووی کردە (شراة)ەکان‌و وتی : ئەمە مەڵبەندی ئەو کەسانەیە کە لە ڕێگە لایانداوەو لە دۆزەخیشدا بەشیان کوێربوونە . . هتد . پاشان لی‌ی پرسین : کی سەردارتانە ؟ وتیان : کوری کواء . علی وتی : باشە بیرتان ماوە ئەو دەمەی کە قورئانەکانیان بەرزکردەوە پێم وتن بڕوایان پی مەکەن ئەمە هەموو فێڵ‌و دەست‌بڕینەو ئەگەر مەبەستیان لەوەبێ کە (تحکیم) بە قورئان بکەن ئەبوایە بهاتنایە لام‌و مەسەلەی (تحکیم) لەمن بپرسن . ئەزانن کە کەس بەقەدەر من ڕقی لە (تحکیم) نەبوو ؟

(شراة)ەکان وتیان . . بەڵی ئەزانین

ئایا ئەوەش ئەزانن کە ئێوە ناچارتان کردم (تحکیم) پەسەند بکەم ؟) من مەرجم ئەوەبوو ئەگەر (تحکیم)ەکە بە پی‌ی نووسراوی خوابوو ئەوا بابکری‌و هەرکاتێك لەوە لایاندا ئەوا منیش‌و ئێوەش لی‌ی دوورئەبین‌و بەپی‌ی فەرموودەکانی خوا ئەجووڵێینەوەو لی‌یان لا نادەین .

(شراة)ەکان وتیان : قسەکەت ڕاستەو بەڕای ئێمە لە ئاینی خوادا ئادەمیزاد (حوکمی) داوە دان بەوەشدا ئەنێین کە کفرمان کرد بەلأم ئیستا کە تۆبە کارین .

علی وتی : باشە ئەوە نازانن کەخوا بۆ تێکچوونی نێوان ژن‌و مێردێك فرمانی (تحکیم)ی داوەو ئەفەرموی (فابعثوا حکما من أهله وحکما من أهلها) .

خۆ ئەگەر لە ڕاویشدا ناکۆکی لەسەر ئەو کەرێشکە هەبوو کە بای نیو درهەمەو ڕی نەکەوتن خودای گەورە فەرموویەتی ئەبێ ئەو کەسانە بڕیاری لەسەر بدەن کە دادوەرن .

(شراة)ەکان وتیان : کاتی عمرو کە نەیهێشت ناوی خۆت بەمیری موسڵمانان لە نووسینەکەتدا بنووسی‌و هەرنووسیت علی عەبدی خوا بەم کارەت خۆت لە خەلافەت خست‌و پێشمان بڵی پیاوان چۆن حەکەمایەتی مەسەلەی خوێن ئەکەن ؟

علی وتی : ئێمەی ئادەمیزاد حوکم دەرنین‌و قورئان حوکم دەرەو لە نێوان دوو دەفەدا هێڵێکی ڕاستەو ئەو نادوی بەلأم ئادەمیزاد پی‌ی ئەدوی .

(شراة)ەکان وتیان : ڕاستی‌یەکەیمان پی بڵی ئەم کارەت بۆچی لەگەڵدا کردن ؟

علی وتی : بۆ ئەوەی ئەوی نەزانە فێر بی‌و ئەویشی ئەزانی بیسەلمێنی‌و بەشکم لەم ماوەیەدا خوا خەڵکەکە چاك بکات‌و بچنەوە شارەکانی خویان‌و خوا بەزەی پیاندابێتەوە دوای ئەم گفت‌وگۆیە بەشی زوریان ڕۆیشتن .

ماوێتی

**پەراویزەکان**

١ – نصر بن
مزاحمی : معركة صفين ل ٢٥٠
المسعودی : مروج الذهب بەرگی (٢)ل ٤٠٠
٢ – الشماخی : السير ل ٤٦
البرادی : الجواهری المشتقاة ل (٦)دەسنووس .
الباونی : الأزهار الأباضية بەرگی (٢٢)ل ٢٨٩
ديوز المغرب ديوز : المغرب الكبير بەرگی (١) ل ٣٤٠
الشماخی : هەر ئەو سەرچاوەیە
طه حسين الفتنه الكبرى بەرگی (٢)ل ٨١ ، ٨٢
٥ – النوبختی : فرق الشيعية ل ٢٦
٦ – ابن طبأطبأ الفخرى في الآداب السلطانية ل ٨٧
٧ – الرازی : اعتقادات فرق المسلمين ل ٤٦
٨ – ابن المبرد الكامل في اللغة والأدب بەرگی (٣) ل ٨٩٢
٩ – الطبری تأريخ الأمم والملوك بەرگی (٤) ل ٥٨٣
طه حسين هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٢) ل ٨١
١١ – فلهاوزن تأريخ الدولة العربية ل ٢٥٧
١٢ – الطبری : هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٥) ل١٨
١٣ – الطبری هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٢٥
١٤–ابن الخطيب : رقم الحلل في نظم الدول ل ١١
١٥ – المسعودی : هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٢) ل ٤٠١
١٦ – نصر بن مزاحم معركة صفين ل ١٦٣ ، ١٦٦
١٧ – الدكتوره سهير
القلماوی ادب الخوارج ل ٩
١٨ – البرادی هەر ئەو سەرچاویە ل ٦٠
١٩ – ابن حيون شرح الأخبار – دەسنووس ل ١٣
٢٠ – ابن قتيبة الأمامة والسياسة بەرگی (٢) ل ٥٠٦
٢١ – قطعة
من كتاب الأديان والفرق دەسنووس ل (٩٦)
٢٢ – نووسەرێکی
نەناسراو كشف الغمة لأخبار الأمة – دەسنووس ل ٢٨٧

٢٣ – ابن حيون هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٨٧
٢٤ – ابن قتيبة هەر ئەو سەر چاوەیە بەرگی (٢) ل ١٨٧
٢٥ – ابن قتيبة هەر ئەو سەرچاوەیە
٢٦ – المسعودی هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٢) ل ٤١٢
٢٧ – ابن الأثير الكامل في التأريخ بەرگی (٢) ل ١٢٧ ، ١٢٨
٢٨ – ابن الأثير هەر ئەو سەرچاوەیە ل ١٣٧ ، ١٣٩
٢٩ – المبرد : هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٢) ل ١٨٣ .
٣٠ – الأصفهانی : مقهتل الطالبيين ل ٢١
٣١ – الشماخی : هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٤٧ ، ٤٨
٣٢ – البرادی هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٦٠
٣٣ – البرادی هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٦٩
٣٤ – طه حسين هەر ئەو سەرچاوەیەی بەرگی (٢) ل ٨١ ، ٨٢
٣٥ – الدينوری الأخبار الطوال ل ١٨٨ ، ٩٠ – ٨٩
٣٦ – فلهاوزن
الخوارج والشيعة ل ٦ ، ١٣
٣٧ – نصر بن مزاحم هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٨٧
٣٨ – الدينوری هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٧٣ ، ٧٤
٣٩ – نصر بن مزاحم هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٢١٧ ، ٢١٨
٤٠ – ابن قتيبة هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٦)ل ١٤٩
٤٢ – نصر بن مزاحم هەر ئەو سەرچاوەیە ل ١٤
٤٣ – فلهاوزن الخوارج والشيعة ل ٧ ، ٨
٤٤ – البغدادی ل ٧٥
الأسفرائيتی ل ٤٦
٤٥ – الطبری هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٥) ل ٥٥
المسعودی هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٢) ل ٤٠٤
ابن قتيبة المعارف ل ٤١٠
٤٦ – الدينوری هەر ئەو سەرچاوەیە ل ١٩٢
٤٧ – المبرد هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٢) ل ٩٠٩
٤٨ – المبرد هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٩٠٩
٤٩ – المسعودی هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٢) ل ٣٠٥

٥٠ – الشيخ جلال
الحنفي التشريع الأسلامي تأريخه وفلسفته بەرگی (١) ل ٥٤
٥١ – الشيخ جلال
الحنفي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٥٧ ، ٥٨
٥٢ – الشيخ جلال
الحنفي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٥٧
٥٣ – محمود اسماعيل
عبدالرزاق الحركات السرية في الأسلام ل ٢٢
٥٤ – محمود اسماعيل
عبدالرزاق هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٢٣
٥٥ – الدكتور عزمي
الصالحي الشاعر الشراتى الطرماح بن حكيم الطائى ل ٤٣ ، ٤٥
٥٦ – الدكتور عزمي
الصالحي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٤٦ ، ٤٧
٥٧ – الدكتور عزمي
الصالحي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٤٧ ،٤٨ ،٤٩
٥٨ – الدكتور عزمي
الصالحي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٤٩ ،٥٠
٥٩ – الدكتور عزمي
الصالحي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٥١ ، ٥٢
٦٠ – الفلهاتى :
محمد بن سعيد (خلافة عثمان وعلى) له نووسینی (الكشف عن البيان)
تحقيق محمد بن عبدالجليل ل ٢٢٣ ، ٢٢٤
٦١ – الدكتور عزمي
الصالحي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٥٢ ، ٥٣
٦٢ – الدكتور عزمي
الصالحي هەر ئەو سەرچاوەیە –هامش (١)ل ٤٣
٦٣ – الدكتور عزمي
الصالحي هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٤٣
٦٤ – محمد رضا
حسن الدجيلى فرقة الأزارقة ل ٧٦ ،٧٧
٦٥ – محمد بن
عبدالجليل هەر ئەو سەرچاوەیەی سەرەوە (خلافة عثمان وعلى)
–الكشف والبيان – ل ٢٢٠
٦٦ – محمد بن
عبدالجليل هەر ئەو سەرچاوەیەی سەرەوە
٦٧ – محمد بن
عبدالجليل هەر ئەو سەرچاوەیەی سەرەوە
٦٨ – نووسەر راستییەکەی خەلافەتی على پێنج ساڵ ویەك مانگ بوو
٦٩ – محمد رضا
حسن الدجيلى هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٧٦
٧٠ – زكى نجيب
محمود المعقول واللامعقول في تراثنا الفكرى ل ٤٨ ،٥٠
٧١ – زكى نجيب
محمود هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٥٠
٧٢ – ناجى حسن الخوارج بين البداوه والتحضر ل ٣٠٦
٧٣ – ناجى حسن هەر ئەو سەرچاوەیە
٧٤ – نووسەرێکی
نەناسراو : تأريخ الخلفاء دەسنووس – ل ١٠٦
٧٥ – نووسەرێکی
نەناسراو : هەر ئەو سەرچاوەیە
٧٦ – ابن الحديد :شرح نهج البلاغة – مجلة العروبة على من امراء الكلام .
٧٧ – نووسەرێکی
نەناسراو هەر ئەو سەرچاوەیە بەرگی (٦) ل ٤٤
٧٨ – زكى نجيب
هەر ئەو سەرچاوەیە ل ٥٦

# پیكاسو زڤری ولاتێ خو

انور محمد طاهر



ئەنیغو كافیرو وەزیرێ رەوشنبیرێ ئسپانی ژ نیویورك زفری مەدریدێ بشتی سەرە دانكا رسمی چەند رۆژا كێشا .

ئەنجامێ ڤێ سەرە دانێ پەیمانك مۆر كر دگەل گارگێریت موزە خانا هونەرێ نی ل نیویوركێ دا تابلوێ «كرینكا» ئەڤێ بیكاسوێ هونەرمەندێ بناڤ و دەنگ نەخش كری .

دەزگایێت رەوشنبیرێت ئسپانی ل ژڤا نی تابلوی بوون دیماهیكا هەیڤا ئەیلولێ بەلێ كار بەدەستێت ئەمریكی بریار دا دەم لدەست بزفرینن بێ ئاگاداری كرن بو رۆژا ئینانێ ژبەر هۆ بێت ئاسای .

ل دیڤ پروگرامێ رسمی ئاماد بینا كەنكە نێت حكومەتێ ئۆ زێرە ڤانیەكا تۆند ، گرینگا گەهشتە ولاتێ دایكیلێ یە ئسپانیا .

ئەڤ پارێ ل هینانێ مەزخەتێ نیڤ ملیون دولار بۆ جەماوەركێ زۆر سیاسیو رەخنەگر هاتن بوونە بێشە وازیا تابلوی .

پولیس ل هەر دو ئالێت جهدێ راوستیا بوون .



ژ باڵە ڤر خانێ هەتا موزە خانا تیابەتێ ئەڤا بۆ گرینگاو پینچو هەفت تا بلوێت دی ئەڤێ بیكاسوی نەخش كرین .

هاتنا گرنیگا ی دەنگ دانەكا مەزن ڤەدا جونكی باشترین تابلو یە بیكاسوی نەخش كری ل ژیانا خۆ ئۆ رەنگدانا مللەتێ وی بێ ئسپانی یە .

دەمێ گوندێ گونیگا رابوی دژی زۆر داریا «نازیا» ئۆكومپەنیە دگەل «فرانكو» ێ دیكتاتور كو پیوەندی دگەل «نازیا» هەبو .

بەلێ ئەڤ گۆندە وێران كر خەلكێ وی گۆشت ئۆ خانێت وان بەرێ وان دان هینانە خارێ ئۆ ئەڤ گۆندە كرە ئەردكێ راست .

ئەڤە یە چیروكا «گرنیگا» ی ئەڤا هۆنەرمەند وبیكاسو . ی نەخش كری سەر داخازیا حكومەتا كۆمارا ئسپانی یا دۆێ دەمێ ل پاریسێ بێ دەر كری بۆ . درێژیا وی باتەی ئەڤێ تابلو سەر نەخش كری ۷٫۸۲ ئۆ پانیا وی ۳٫۵۱ ئۆ لسەر هەشت ڤوناغا نەخش كر بو نێزیكی دو هەیڤا ما یێڤە «ناسی نامە



«یەك یا ل بال حكومەتا ئسپانی كۆ ئەركێن بالیوزێ ئسپانی ل فرنسا «۱۵۰»ی هەزار فرنك بێ دانی یە حەقێ ڤی تابلوی دەفترا هژمێر یارا یالیوز خانێ ئەڤێ چەندێ ئسبات دكەت .

ئەڤ ناسی نامە بەلكە بوو دەستێ حكومەتا ئسپانی سەر ڤێ چەندێ دەست ب گفتوگۆ كرنێ ل ناڤ بەینا میرات گرێت بیكاسوی ئو حكومەتا ئسپانیا بوهینا تابلوی ژ نیویورك بو مەدریدێ داخازكرنا ئسپانیا دی میراتكرێ هونەری بشتی مرنا « فرانكو »ی ئو هاتنا حكومەتا دەستوی ل ئسپانیا حكومەتا ئسپانی ژ سالا «۱۹۷۷»ێ ئەڤ داخاز كر دەمێ كابانیاسێ وەزیری دادی یە بۆ ئەڤ ڤێ گافێ وەزیرێ رۆشنبیرێ یە .

بەلێ حكومەتا ئەمریكی داخازیا ئسپانیا غەم ساردی ڤە وەر دكرت ئو بشت كو هێ خو هاڤێت .

ئو دگوت بیكاسوێ كو دژیان خودا نە گوتی یە تابلوی ژ نیویورك بەنە چ جهێت دی ئو ئەڤە دكر هانە بخو .

حكومەتا ئسپانی گەلەك ئاستەنك كەتنە رێ دا چاكلینی ژنا بیكاسوی رایا خۆ نەدا ئو قەت چ ئارزو نەبو كو گرنیكا بزڤریتە « مدریدێ » « هەر چەندە میرا تگرێت دی رازی بوون ب ڤێ چەندێ .

بەلێ ئەمریكا سەر هندێ رك گرتی بوو حكومەتا ئسپانیا گوت دێ ڤێ چەندێ گەهینە دادگەها جیهانی « لاهای » بەلێ بشتی هاتو چۆن ل ناڤ بەینا هەر دو حكومەتا . . سیاستا ئەمریكا هۆسا دخازت كو پیوەندێت وان دگەل ئسپانیا خوشی بن جونكی ئسپانیا دكڤتە جهكێ ئیستراتیجی نسبەت ئەمریكا ژبەر هندێ كۆنگرێسێ ئەمریكی رازی بینا خۆ دیار كر كو «تابلو»ی بدنە ئسپانیا بیكاسوی سەر دەمێ خۆ چ شەرح وئاخفتن سەر ڤی تابلوی نە گوتن هێلا رەخنەگر ب ئارەزویا خو بەحس ژێ بكەن .

ئو ژبەر شەرێ جیهانی بیكاسوی بریار دا ئەڤ تابلویە ل نیو یوركێ بیت هەتا دیموكراتیەت بزڤریتە ئسپانیا .

ب سێ هلكەفتنا گرنیكا ژ موزە خانا هونەری هەڤ جەرخ دەركەتبو ل سان بالو سالا « ۱۹۵۳ » ئو ل پاریسێ سهلا (۱۹۵۵)ێ ئو ل میونیخ سالا « ۱۹۵٦ »ێ هندە تێك چۆن ل تابلوی پەیدا بوو جارەكا دی بیكاسوی نەخشی كرە ڤە هۆسا گرنیكا زڤری وولاتێ خۆ ڤێجا ملەتی بێشەوازی وی كر ب هەمی چینێت سیاسی .

بەلێ چێنا راست رەوا دژوار « منطرف » نە دڤیا «گرنیكا بزڤریتەڤە .

حكومەتا ئسپانی بریار دا تابلوی بكەنە موزەخانەكا تایبەتی ل « رونیر » نێزیكی موزە خانا « برادو » ل هۆلكا هۆسا بۆ دورستكر كو گەرم وسارما رەنگێ تابلوی تێك نەدت ئو تابلو كر دشیشكێ دا كوكۆلە ژێ تێ نەجیت .

ئو هندە پاساوانێت ئەمیندار زێرەڤانی یە لێ بكەن ئو هەیڤا تەشرینا چوی خەلكی جیهانێ چۆنە تەواڤا « گرنیكای » .

دانا نا تابلوی ل پایتختێ خەلكێ باسك رازی نەبوو چنكی وان دگوتن دڤێت ل هەریما مەبیت چنكی بەحسێ كارەساتا گوندێ مە دكەت ئو گوندێمە «گرنیكا »یە بۆیە هیڤێنێ هزرو بیرێت وی هەتا ئەڤ تابلو یە نەخشی كری «بەلێ + «گرنیكا» ما ل مەدریدێ چنكی تابلوی نرخەكێ نیشتمانی یێ هەی .

# سینەما



**ئامادەکردنی : حمە شوان**

**هەموو خۆماندووکردنێك و مل‌ملانێیەکی مرۆڤ لەپێناو خۆش‌گوزەرانی و پێشخستنی ژیانی و رزگاربوونی‌یە لەو یاساو رژێمە بۆگەنانەی کە دژی مرۆڤایەتی دانراوون .**

**لە ژیانی مرۆڤدا چەند هۆیێك هەن کە بۆ ئەو رزگاربوونە رۆلێکی سەرەکی دەبینن . . . هونەریش یەکێکە لەو هۆیانە .**

هونەر بە چەند جۆرێك لێکدراوەتەوەو چەند پێناسینێکی بۆ دانراوە . . هەر فەیلەسووفێك و هەر سینەماناسێك بە جۆرێك بۆی چووە .

هونەر ژیانە . . . هونەر گۆرانە . . . شۆرشە . . . رەنگدانەوەو ئاوێنەی ژیانە .

سێرگی ئایزنیشاین)ی پێشەوای سینەمای سۆڤیەتی دەربارەی هونەر دەڵێ :

زۆرمان لە رێگای شۆرشدا هاتووینەتە بواری هونەر . . وە هەموومان لە رێگای هونەر بەرەو مەیدانی شۆرش دەچین . سینەماش خۆی بە یەکێك لەو هونەرە جوانانە لە قەڵەم دەدات کە بەشداری ژیانی مرۆڤی کردووەو بووەتە هۆی گۆرینی باری ژیانی لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر .

زۆر هونەری تر بەشداری لە هونەری سینەمادا دەکەن ، وە گشت هونەرەکان لە ئامێزی سینەمادا خۆیان دەبیننەوە .

سینەما زۆر راستیمان بۆ دەردەخات . بۆ وێنە کاتێ کە مرۆڤ توانی بۆ یەکەم جار پێی بنێتە سەر مانگ ، بە هۆی فیلمی سینەماوە توانرا ئەم راستیە بسەلمێنرێت .

هەروەها زۆر نهێنی تر هەن کە مرۆڤ بە هۆی سینەماوە دەتوانێ چاوی پێیان بکەوێت . . . وەك نهێنیەکانی ناو دەریاو رووداوەکانی دوو شەری گەورەی جیهان و زۆر بابەتی تر .

ئاشکراو دیارە کەوا سینەما تا چ رادەیێك هاوسەری ژیانی مرۆڤی کردووە ، تەنانەت سینەما بە جۆرێکی وا خۆی لە ئارەزووی مرۆڤ نزیك خستۆتەوە کە لەو جێگایانەی کە بۆ ماوەیێکی کەم کاتی تێدا دەباتە سەر سینەما بەدی دەکرێت ، وەك لە ناو پاپۆرو یانە وەرز شیەکان و قوتابخانەو شوێنەکانی حەوانەوە و زۆر شوێنی تر .

ئێستا سینەما بووە بە پێویستییەکی گرینگی مرۆڤ‌و خێزان بەتایبەتی دوای هاتنەناوەوەی ڤیدیۆ . سەرەرای پەیدابوونی جۆرێکی تری سینەما کە ( سینەمای ( کاسێت )ی پێ دەووترێت .

هەرچەند لە سەرەتادا تەلەفزیۆن ویستی مل‌ملانێ لەگەڵ سینەمادا بکات بەڵام تیایدا سەرنەکەوت ، بەتایبەتی دووای تەواوبوونی شەڕی دووەمی جیهان ، کە تەلەفزیۆن بە جیهان‌دا بڵاوبووەوە و کارێکی زوری کردە سەر پیشەسازیی سینەما . لە هەمان کاتیشدا لە زۆر لایەنی گرینگەوە بۆ مەبەستی راکێشانی سەرنجی بینەرانی ، کارێکی بنەرەتی کردە سەر پێشخستنی سینەما . وە چونکە تەلەفزیۆن کە بە ئامێری پیشاندانی ماڵەوە دادەنرێت ، لە توانای‌دا نیە زۆر بەرهەم یان بابەتی جیاواز ( چ لە بارەی تەکنیك چ لە بارەی ناوەرۆك ) پێشکەش بکات .

لێرەدا بۆمان ئاشکرا بوو کە سینەما چەند پیرۆزەو چۆن دەوری خۆی دەبینێت‌و بووە بە شتێکی پێویست لە ژیانی خێزاندا .

دەبینین منداڵان هەر کە تەمەنیان لە حەوت هەشت ساڵی تێپەڕی حەز بەوە دەکەن هەموو رۆژێك بچنە سینەما . . هەروەهاش ئافرەت‌و گەنج‌و بەساڵاچووانیش هەر کە دەرفەتیان بوو کاتی خۆیان بە چوونە سینەما دەبەنە سەر . بەردەوام پرسیارێك دێتە گۆڕێ :

بۆچی حەز لە سینەما دەکەین ؟ بۆچی بۆ سینەما دەچین ؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ، زۆر رای جیاواز هەیەو هەر کۆمەڵە سینەماناسێك بە جۆرێك بۆی دەچێت . . لە هەموویان دیارترو گرینگتر :

– بۆ کات بردنەسەرو خۆش‌رابواردن .
– بۆ پەرەپێدانی رادەی رۆشنبیری‌و دەرکەوتنە سەر هونەری گەلان‌و باری ژیانیان .

کە سینەما ئەوەندە گرینگ بێت ، دەبێ بزانین سینەما چیە ؟ لەم بارەیەوە دەرهێنەرو رەخنەگری سینەمایی فەرەنسی (ئەندرێ بازان) دەڵێت :

چۆن زمان گرینگەو ئەبێ فێری ببین ، ئاواش سینەما گرینگەو ئەبێ لێ‌ی نزیك ببینەوە .

**سینەما لە روانگەی چەند دەرهێنەرێك،**

ئەنگرمان برەگمان دەڵێت ، سینەما بریتیە لە لێکۆڵینەوەیێکی وجوودی بەلای (بەرناردو بەرتولۆچی)یەوە دەربڕینێکی گۆرانی ئامێرە ، فرانشسکۆ رۆزێش بۆ رایەکی تر چووەو وتوویەتی کۆمەڵە هەواڵێکی مێژوویی‌یە ، هەمیشە بە چەکێکی سیاسی دادەنێ ، لەم بابەتەوە راو بۆچوون جۆراوجۆرە .

**سەرەتای پەیدابوون :**

پاش ئەوەی لە بارەی گرنگی‌ی سینەماوە کەمێك دواین دێینە سەر باسی‌ئەوە بزانین ئەم هونەرە لەسەرە تانا چۆن‌و کەی‌و لەکوێ سەری هەڵداوەو کێ بە دانەری ئەم هونەرە دادەنرێ ؟

بێگومان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە پێویستمان بە لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژو ووردی مێژوویی هەیە ، بەڵام ئێمە لێرەدا بە چەند دێڕێك‌و بەپێ‌ی توانا پوختەی وەڵامەکان پێشکەش دەکەین :

سینەما لە سەرەتادا بە شێوەیەکی ساکاری بێ‌دەنگ بەهۆی چەند ئامێرێکی وێنەگەورەکەری روناکی دەری وەکو (میصباحی سیحری) دروست‌بوو ، ئەمە شێوەیەکی سادەی دەزگای پیشان‌دان بوو ، وێنەکانیش بە کامێرایەکی ساکارو تەنیا بۆ یەك جار بەکاردەهێنران . دەتوانین رۆژی ٢٢ی شوباتی ١٨٩٥ بە رۆژی لەدایك‌بوونی سینەما دابنێین لە جیهاندا ئەویش پاش هەوڵێ و تێکۆشانی لویس‌و ئۆگست لۆمیری جووتە برای فەرەنسایی کە لە کارگەکەی باوکیان ئیشیان دەکرد توانییان فلیمێك بەرهەم بهێنن تابڵۆی ساکارو بە ناونیشانی (هاتنە دەرەوەی کرێکاران لە کارگەکەی لۆمیر) کە لە کۆمەڵەی پەرەپێدانی پیشەسازیی نیشتمان پێشانیان‌دا .

لە ٢٨ی کانوونی یەکەمی ئەم ساڵەشدا فلیمی (گەیشتنی شەمەندەفەر) یان بۆ بینەرانێکی زۆرو لە (گراند کافێ) لەسەر شەقامی کیوشینی پاریس پێشکەش کرد .

بەم جۆرە سینەما سەری هەڵداو خۆی خستە رێزی هونەرە جوانەکان‌و جووڵانەوەیەکی گەورەی لە هونەری ئەو سەردەمەدا دروست کرد ، ئیتر ووڵاتانی تریش لە جیهان خۆیان پێوە خەریك کردو خێرا تەشەنەی کرد . ئەوەبوو لە ٢٩ی شوباتی ١٨٩٥ گەیشتە برۆکسل ، لە ١١ی ئاداری هەمان ساڵیش گەیشتە لەندەن‌و لە ٢٨ی حزیرانی ١٨٩٥ لە نیۆیۆرك دەرکەوت‌و لە کۆتایی ئەم ساڵەشدا پەڕیەوە رووسیا .

دەبێ ئەوەش لە یاد نەکەین کە لە سەرەتادا سینەما تەنیا بۆ پاشایان‌و میرو قەیسەرەکان بوو . بەڵام سینەما هەر بەشێوە

بێدەنگی‌یەکەی خۆی نەمایەوەو دوای پێشکەوتنی تەکنیکی پیشەسازی لەلایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە مرۆڤ ویستی ئازارەکانی خۆی بە هۆی ئەم هونەرە نوێیە بخاتە روو ، بۆیە لە تێکۆشان نەوەستا تا ساڵی ١٩٢٧ سینەمای دەنگدار پەیدابوو و بوو بە بەرپەرچ دانەوەیەکی شانۆی پیشاندان «استعراضی» .

ئیتر سینەما بەناو وولاٌتاندا بلاٌوبووەوەو بەرهەمی فلیم زۆر بوو ، هەمیسان ئەمەش پەیوەندیی بە باری پیشەسازی‌یەوە هەیە چونکە سینەما خۆی بە پیشەسازی دادەنرێ ، لە وولاٌتە سەرمایەدارانیش سەرباری ئەمە بوو بە جۆرە بازرگانی‌یەك !

**مەهرەجانی سینەما :**

بۆ هەڵسەنگاندنو هەڵبژاردنی چاکترین فلیم ، دەرهێنەرو ئەکتەرو سینەماکارەکان بیریان لە مەهرەجانێك کردەوە کە وولاٌتان تێیدا بەشدار بن و خەلاٌتیش بەسەر لێهاتووەکاندا دابەش بکرێت . یەکەم مەهرەجانی لەم جۆرە ئەکادیمی هونەرو زانستی سینەمای ئەمریکی رێکیخست ، لە ساڵی ١٩٢٧ لەژێر ناوی (ئۆسکار) لە کانوونی دووەمی ١٩٢٩دا ئەکادیمی یەکەم خەلاٌتی بە فلیمی (ئاوازەکانی برودوای)دا .

پاش ماوەیەکیش لە وولاٌتانی رۆژهەلاٌتی ئەوروپاو وولاٌتانی جیهانی سێیەم مەهرەجانی سینەمایی بلاٌوبووەوە و ژمارەیەکی زۆر لەم وولاٌتانە بەشدارییان تێدا دەکردو ئێستا لەناو کۆمەلاٌنی




گەلاندا گێرانی ئەم جۆرە ڤیستڤالانە بووەتە شتێکی باو ، گرنگترین ئەم ڤیستڤالانەش ئەمانەن :

ئۆسکار ، ڤینیسیا ، لایپزك ، موسکۆ ، کانی نێودەوڵەتی ، بەرلین ، سان سباستیان ، قەرطاج . . هی تریش .

لە عیراقیشدا سێ جۆر ڤیستیڤاڵ هەن کە ئەمانەن :

١ - ڤیستیڤالی فلیمی عیراق :

هەموو ساڵێك لە ٣١ی تەمووز تا ٦ ی ئاب بە سەرپەرشتی دامەزراوی گشتی سینەماو شانۆ لە بەغدا ئەم مەهرەجانە دەکرێت .

٢ - ڤیستیڤالی فلیمو پروگرامی نێودەوڵەتی‌ی فەلەستین :

هەر دوو ساڵ جارێك لە ١٥ - ٢٠ ی ئادار بە سەر پەرشتی دامەزراوی گشتی رادیۆو تەلەفزیۆنو بە یارمەتی یەکێتی ئیستگەکانی رادیۆی وولاٌتانی عەرەب رێك دەخرێت .

٣ - ڤیستیڤالی فلیمی لاوانو ئارەزوومەندان :

ئەم مەهرەجانەش ساڵانەیە لە ٢٧ - ٣٠ی نیسان رێك‌دەخرێتو سەرۆکایەتی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە بەغدا سەرپەرشتی دەکات .

سینەما بەردەوام بەرەوپێشەوە رۆیشتووەو بوو بە هونەرێك لە هەموو هونەرەکانی‌تر لەناو خەلکدا بلاٌوترو توانی لە هەموو کونجێکی جیهان جێ‌ی خۆی بکاتەوە .

دەزگاکانی راگەیاندنو دامەزراوە سیاسی‌یەکان هەوڵیان زۆرداوە کە تا ئەوپەڕی توانا سوود لەم هونەرە وەربگرن با بە شێوەیەکی لاوەکیش بێت بەشداری تێدا بکەن .

**یانەی سینەما .**

بۆ ئەوەی کۆمەڵی بینەران بتوانن لەکاری سینەمادا بەشداری بکەنو رووبەرووی لایەنانی سلبیو ئیجابی‌ی سینەما ببنەوە (یانەی سینەما) هاتە کایەوە کە بریتی‌یە لە مەڵبەندێك فلیمی تێداپێشکەش دەکرێ بەر لە پێشکە شکردنی فلیمەکە دەرهێنەر باسی دەقی نووسینی درامایی‌و لایەنەکانی تەکنیکی فلیمەکە دەکاتو ئەکتەرو مونتێرو بەشدارانی فلیمەکە بە خەڵکەکە دەناسێنێ کە ئەم شتانە لە سینەماخانەدا بەدی ناکرێن .

مێژووی دانانی یانەی سینەماش دەگەڕێتەوە ساڵی ١٩٢٤ کاتێك کە شارل لیخێ یەکەم یانەی لە فەرەنسا داناو دوای سەرکەوتنی تاقیکردنەوەکە ئێستا لە هەموو وولاٌتاندا یانەی سینەما بەدی دەکرێت . بینەر سوودێکی زۆری لێ وەردەگرێتو رۆشنبیری پێ پێش‌دەکەوێت . لە وولاٌتەکەی خۆشماندا یانەی سینەما دەوری خۆی دەبینێ وەکو یانەکەی ئەکادیمی هونەرە

جوانەکانو یانەی سینەمای لاوان لە بەغدا .

**قۆناغەکانی ناوەرۆك :**

سینەما لە ڕێگای ژیانیدا بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە تا گەیشتووەتە ئەم تەمەنە ، تەمەنی سینەماش بە تەمەنی مرۆڤەوە بەستراوەو گرنگترین قۆناغەکان ئەمانەن :

– سینەمای کلاسیکی ، کە لە سەرەتای سەرهەڵدانی سینەماوە دەست پێ دەکات ، فلیمەکانی بە شێوەیەکی گشتی لە ژیانی مرۆڤو هێزەکانی دەوروپشتی دەدوا لە شێوەیەکی کۆمیدیایی بێدەنگدا وەك فلیمەکانی شارلی چاپلن .

پاشان سینەمای ڕومانتیك کە بەرهەمی ئەدەبی نووسەرە گەورەکان بوو بوو بە بابەتی فلیمەکان وەك بەرهەمەکانی مولیێرو هۆکۆو شەکسپیرو . . هتد .

دوایی سینەمای ڕیالزمیش سەری هەڵدا کە لەم ڕووەوە فلیمەکانی سێرگی ئیزنشتاین بەناوبانگن ، پاشان سینەمای سوریالیو چەند جۆرێکی تریش پەیدا بوون .

فلیمەکانی (تەرزان)و (هێرقل) کە لە ئەفسانەکانی یۆنانی وەرگیرابوون هەروەها فلیمی (کاوبۆی) و دوای دوو جەنگە جیهانییەکەش فلیمی شەڕو شۆڕ کەوتنە باو .

ئیتر سینەما بوو بە هۆیەکی ڕۆشنبیریو کات بەسەربردن لە هەمان کاتدا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لە هەموو بابەتەکانی ژیانی مرۆڤ فلم بەرهەم بهێنرێ وەك فلیمی کۆمەلأیەتی ، مێژوویی ، سیاسی . . هتد ، پاشان فلیمی زانستیو خەیاڵی زانستی وەك گەشتی مرۆڤ بەناو ئاسمانو ئەستێرەکاندا گوری سەند .

بەم جۆرە بەرهەمهێنانی فلم بەرزبووەوە ، کە ئێستا لە زۆر لە وولأتە سەرمایەدارەکاندا پیشەسازیی سینەما بووەتە هۆیەکی بازرگانیو کۆمپانیاکان فلیمی کاڵوکرچ دەردەکەن .

**چەند زاراوەیەکی سینەمایی :**

– سینەما تۆگراف Cinemato graphe

وشەیەکی یۆنانییە پێکهاتووە لە وشەی Cinama واتا جووڵە Graphe واتا پەراو (کتێب) . لیۆن پۆل یەکەم کەس بوو ئەم زاراوەیەی بەکارهێنا بۆ ئامێری پیشاندان (جهاز العرض) لە ساڵی ١٨٩٣دا .

– کامێرا Camera

وشەیەکی لاتینییە بەمانا ژووروچکەی ڕەش ، کە ئامێری وێنەگرتنە .

**فلیم Filme**

وشەیەکە لە ئەنگلوسەکسۆنییەوە وەرگیراوە بە مانا (پێستی نەرم یان توێکل) دێت کە وێنەی لەسەر تۆمار دەکرێت .

– **ستۆدیۆ Studiu**

**وشەیەکی ئیتالیاییە بە مانا شوێنی کارکردن کە هەندێ دیمەنی لێوەردەگیرێو لە هەمان کاتدا (لابۆر) ی شۆردنەوەی فلیمەکانیشە .**

– **سیناریۆ Scenario**

لەو پارچە نووسینانە پێك دێ کە دەخرێنە سەر دەقی بابەتەکەی کە دەگیرێو بەشبەشی دەکات بۆ چەند (لەقتە) یەك و چەند دیمەنێك بەپێی پێویست .

– **(لەقتە) Shot**

**بەشێکە لە فلیمەکە کە تێدا تەنها جارێك وێنە دەگیرێ بەبێ وەستانی کامیراکە .**

**جۆرەکانی (لەقتە) :**

١ – **(لەقتەی) گەورە** Closs – up

ئەو (لەقتە)یەیە کە وێنەیەکی گەورەی تێدا وەردەگیریو کامیراکە نزیکە لە بابەتەکەوە ، بە نموونە ئەگەر بابەتەکە پیاوێك بێت تەنها سەری دەردەکەوێت .

٢ – (لەقتە) ی گەورەتر Big Clos Up

وێنەیەکی گەورەتر لە وێنەی یەکەم ئەگرێو کامێراکە زۆر لە بابەتەکەوە نزیك دەبێت ، بە نموونە ئەگەر بابەتەکە پیاوێك بوو ئەوا تەنیا بەشێك لە دەموچاوی دەردەکەوێت تەنیا دەمی یان لووتی دەردەکەوێت .

٣ – (لەقتە)ی ناوەندی Mediam – Shot

ئەو لەقتەیە کە کامیراکە نە زۆر نزیکەو نە دوور ، وەکو هەموو لەشی پیاوەکە وێنە دەگرێ .

٤ – لەقتەی ئەمریکی : ئەو لەقتەیەیە کە لە (لەقتە)ی ناوەندی کەمێك نزیکترە ، نموونە : پیاوەکە لە سەرییەوە تا کو ئەژنۆی .

٥ – لەقتەی دوور : Long Shot

+ م ل قتەیەدا کامێراکە لە شوێنێکی دوورەوە ئیش دەکات واتا ماوەی نێوان کامێراکەو بابەتەکە ماوەی دوورە ، نموونە ، پیاوەکە لەسەر گردێك .

٦ – لەقتەی پان Pan

وشەی پان کورتکراوەی وشەی پانۆرامایە Panorama

کە بە مانای چاوپێخشاندنێکی خێرایە . بۆ ئەم جۆرە لەقتەیە کامێرا دەجوو لێنرێ بەلای راستدا یان بەلای چەپدا وە بە شێوەیەکی خێرا ، بە نموونە :
کاتێك کە پیاوەکە دەروات لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر .
٧ – لەقتەی زوم Zoom
بە جوولاندنی کامێراکە بۆ پێشەوە بەرووی بابەتەکەوە بە شێوەیەکی خێرا ، نموونە : کاتێك لەقتەیەکی ناوەندی دەگیرێ (لەشی پیاوەکە)و یەکسەر لەم لەقتەیە دەچێت بۆ لەقتەی کلۆز (تەنیا دەمی پیاوەکە) پیشان دەدات بەم جوولاندنەوەیەی کامیرایە (بەبێ وەستان لە وێنەگرتن) دەووترێ جوولانەوەی زوم (لەقتەی زوم)
٨ – لەقتەی شاریو Traking
ئەو لەقتەیەیە کە کامێراکە تێدا دەجوولێنرێ بۆ پێشەوە یان بۆ دوواوە یان بۆ لای راست یان چەپ ، وە کامێراکە لەسەر سکەیەکەوە جێگیر دەکرێت .
– **دیمەن (مەشهەد)** :
بریتی یە لە زنجیرە لەقتەیەك کە چارەسەری تەنیا فیکرەیەك دەکەن ، کۆمەڵە دیمەنێکیش پێکەوە دەبەسترێت ، یەکەیەکی درامایی پێك دەهێنن لە فلیمەکەدا ، نموونە : پیاوەکە لەسەر گردەکە دێتە خوارێ .
**کادر** : **Cadrag**
ئەو شوێنە بینراوەیە کە ئاوێنە (عدسە)ی کامێراکە دیاری دەکات ، نموونە : ئەو شوێنەی کە پیاوەکەی تێدا دەوەستێ .
– **فلاش باك Flash – Back**
گێرانەوەی بابەتێك کە لە رابردوودا رووی داوە ، بە نموونە : کاتێك کە پیاوەکە خەیاڵ دەکاتەوە یان رووداوێك دەگێرێتەوە .
– **کلاکێت** : **Clapper Board**
ئەو پارچە تەختەیەیە کە لەپێش گرتنی هەر لەقتەیەك دەردەکەوێت و ناوی فلیمەکەو هەندێ بابەتی تری لەسەر دەنووسرێت ، لە کاتی فلیمی دەنگداردا لایەکی تەرخان دەکرێ بۆ کارتێکەرە دەنگی یەکان .
– **تولیف**
بریتی یە لە برِینی فلیمەکە وە هەڵبژاردنی ئەو لەقتانەی کە باشن وە لابردنی لەقتەکانی تر کە دەرهێنەر بە دڵی نەبووە .
– **مونتێر Monteur**
ئەو کەسەیە کە تایبەتە بە برِین و پێکەوەنانی پارچەکانی



فلیمەکە بەپێی برِیاری دەرهێنەرەکە . ئەم کارەش بەهۆی ئامێرێکەوە دەبێت کە تەماشای فلیمەکە دەکات (واتە لەقتەکان کە پێی دەگوترێ مۆفیولا .

**سەرچاوەکان**


١ – قصة السينما (تأريخ ، فن ، ثقافة) تأليف صلاح دهني دار العلم للملاين ١٩٥٠ – بيروت .
٢ – خطوات على طريق السينما – تأليف زهير الخالدي – المؤسسة العربية للدراسات والنشر – بيروت ١٩٧٩
٣ – من الثورة الى الفن ومن الفن الى الثورة – تأليف سيرجي أيزنيشتاين ، ترجمة سعيد مراد – دار الفارابي – بيروت ١٩٧٩
٤ – قضايا الساعة عدد – ٦ – السينما المعاصرة ، تأليف روبير لافون جرامون ترجمة مومي بروى ، الناشر للطبعة العربية – جنيف ١٩٧٧ .
٥ – السينما العراقية دراسات ووثائق – احمد سالم كتاب فنون (٣) وزارة الثقافة والاعلام – دار الحرية للطباعة – بغداد ١٩٨٠ .
٦ – تقنية السينما تأليف لودوكا – ترجمة فايز – منشورات عويدات ، بيروت ١٩٧٢ .
٧ – كيف تؤلف الافلام تأليف هيو بادلى ترجمة فريد المزاوى – المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة – قاهرة – مطبعة ٥ جـ .

# سروشت و مرۆڤ و پیس بوون

عمر علی درویش

سروشت وەك هونەرمەندی رۆمانی «ئۆجین دێلاکراو» دەڵێت (بینایەك نی‌یە بەلام کەرەستەیەکی خاوە بۆ بینا دروست کردن) ئەمە جگە لەوەی کە زاناکانی تر بەشێوەی هەمەجۆر پێناسەیان بۆ سروشت داناوە ، چونکە لەو رۆژەی سروشت ئاشنایەتی لەگەڵ مرۆڤدا پەیداکردو پەیوەندی لەگەڵ شوێنەوارەکەی‌دا پتەوتر کرد زۆر گیروگرفت پەیدابوو کە بوونە بەربەستێك لەرێ‌ی خواست‌و ئارەزووی مرۆڤدا ئەویش بەهۆی مانەوەی پاشماوەو پاشەرۆی ئەو شتانەی کە بەکاریان دێنێ کە ئەمەش دەبێتە هۆی پیس‌بوونی شوێنەوارەکەی .

گونجانی مرۆڤیش لەگەڵ سروشتدا لەسەر بنچینەی یەکەیەکی تەواوی شوێنەوارە چونکە زەوی توانای کشانی نی‌یە — جگە لەو زەوی‌یە لیتاوییانەی کە لە ئەنجامی هەڵگرتنی لیتەی رووبارەکان دروست دەبەن .

بەلام ژمارەی زیندەوەرەکان رۆژ دوای رۆژ رووەو زیادی دەروات کە ئەمەش زۆر گیروگرفتی وەك ، نەخۆشی بێ‌ئیشی ، بەرزبوونەوەی نرخی شتومەك ، . . هتد . بلاودەکاتەوە . چونکە وا چاوەروان دەکرێ لە سالی ٢٠٠٠ دا ژمارەی دانیشتوانی گۆی زەوی بگاتە ٧ ملیار کەس کە ئەم ژمارە زۆرەش پیویستی بە ئامادەکردنی خۆراك ، دەزگا گشتی‌یەکان ، خانوبەرەو مەڵبەندی تەندروستی‌و قوتابخانەو زۆر شتی تر هەیە ، دابین کردنی ئەم شتانەش شتێکی ئاسان نی‌یە هەر لەو ساڵەشدا «سالی ٢٠٠٠» ئاستی پیس‌بوونی جیهانی لە شوێنەواردا دەبێتە ١٠ ئەوەندەی ئێستا .

هەر بۆیە پاراستنی‌و چاككردنی شوێنەوار بوو بە هۆی پیویستی‌یەکی بەردەوامی مرۆڤ تا بتوانێ بە شێوەیەکی دروست سوود لە شوێنەوارەکەی وەربگرێ . پیس‌بوونی شوێنەواریش وەك دیاردەیەکی ئاشکرا لە سروشتدا کێشەیەکی زۆر ئالۆزو ئەم‌ومژاوی لە مێشکی زۆر کەسدا بەرپاکرد ، شوێنەواریش بەندە لەسەر ئاو ، هەوا ، گڵ — یان خاك — ، رووناکی ئەم



توخمانەش پێویستن بۆ ژیان بە ڕێژەی چەسپاوی خۆیان ئەگەر ئەم ڕێژەیە زیادی‌کرد یان کەمی‌کرد لە ڕێژەی سنوورداری تایبەتی ئەو توخمە ئەوا ئەو کاتە دووچاری پیس‌بوون دەبێن ئێستاش باسی ئەو توخمانە دەکەین :

**١ – هەوا :**

برێتی‌یە لە بەرگێکی گازیی جیاواز کە دەوری گۆی زەوی داوەو توخمێکی سەرەکی‌یە بۆ زیندووان چونکە لە کاتی هەناسە وەرگرتندا برێکی باش لە گازی ئۆکسجین وەردەگرین‌و هەموو ڕۆژێك سییەکان نزیکەی ١٥ کیلۆگرام گاز وەردەگرێت‌و دەی‌داتەوە . بەڵام هەندێك لە بەکتریا دەتوانن بەبێ هەوا بژین .

هەواش ئەگەر ماددەیەکی بێگانە تێکەڵ بە پێکهاتووەکەی بوو وەکو پاشماوەی گازی کارگەکان ئەوا ڕێژەی ئەو توخمانەی کە هەوایان لێ‌پێك‌هاتووە دەگۆڕێت ، هەواش بەهۆی ئەمانەوە پیس‌دەبێت :

١ – تەقینەوەی بورکان

٢ – بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی

٣ – تەقاندنەوەی چەکی ئەتۆمی‌و نیوترۆنی .

٤ – هەڵکردنی ڕەشەبا .

٥ – پاشماوەی گازی کارگەکان .

٦ – ماددەی سووتاندن – وەك سووتاندنی دارو تەختە .

وەنەبێت مرۆڤیش تاکە ڕەگەزێك بێت هەست بە پیس‌بوونی هەوا بکات بەڵکو زۆر چەشنی گیان‌لەبەر هەست بەم پیس‌بوونەی هەوا دەکات ، بەنموونە : سەگ لەکاتی پیس‌بوونی هەوادا هەست بە تەنگەنەفەسی دەکات .

**ئاو :**

توخمێکی بنچینەیی‌یە بۆ ژیان هەموو ڕۆژێك لەشی هەر یەکێك لە ئێمە ٢,٥ کیلۆگرام ئاو هەڵدەمژێ هەروەها توخمێکی پێویستە بۆ خانەی زیندوو وە هەموو ڕۆژێك تاکە مرۆڤێ ٤٠ – ٥٠ لیتر ئاو کاردەکات بە مەبەستی خواردنەوەو شتن ، لە هەندێ شوێنی تریشدا پێویستی مرۆڤێك دەگاتە ١٠٠٠ لیتر ، ئاویش کە ماددەیەکی بێگانەی لەناودا بوو یان دۆخەکەی گۆڕا چ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ، پیس‌دەبێت . پیس‌بوونی ئاویش لە ئەنجامی : .

١ – پاشماوەی شلی کارگەکان کە تێکەڵ بە ئاوی ڕووبارو سەرچاوەو کانیاوەکان دەبێ .

٢ – پیس‌بوون لە سەرچاوەی کشت‌وکاڵی‌یەوە ئەمیش بەهۆی ئەو ماددانەی کە بەکاردێن بۆ لەناوبردنی مێروو جروجانەوەرو پەین‌کردنی زەوی کە بەهۆی ئاوی بارانەوەوە تێکەڵ بە ئاوی خاوێن دەبێ و پیسی دەکات .

٣ – ئاوەڕۆی ژێرزەویی شارەکان .

٤ – فڕێدانی لاکی گیاندارانو پاشماوەی خۆراك بۆ ناو سەرچاوەی ئاوی پاك .

ئەم پیس‌بوونەش کاردەکاتە سەر ئاستی تەندروستی هاووڵاتیان و دەبێتە هۆی لەناوبردنی ژمارەیەکی زۆر لە زیندەوەرە ئاوی‌یەکانی وەك ماسی‌و قرژاڵو زۆر زیندەوەری تر .

**٣ – ڕووناکی :**

توخمێکی سەرەکی‌یە بۆ زیندە چالاکی‌ی زیندووەکانو کرداری ڕۆشنە پێکهاتنی ڕووەك زۆر جار لە کاغەزی ناو دەرمان نووسراوە – دەبێت ئەم دەرمانە لە ڕووناکی دووربخرێتەوە چونکە ئەم ڕووناکی‌یە دەبێتە هۆی کارتی‌کردنی پێکهاتووەکانی دەرمانەکە .

**پیس‌بوونی خاك «گڵ» :**

سەرچاوەی پیس‌بوونی گڵ زۆر شتە لەوانە فڕێدانی پاشماوەی ڕەقی ماڵان «قووتوو ، شووشە ، نایلۆن ئامێری پەك‌کەوتەو زۆر شتی تر کە ئەم ماددانە کاردەکەنە سەر پێکهاتووی گڵەکەو دەبێتە هۆی زۆربوونی هەندێ توخم‌و کەمی‌ی هەندێ توخمی تر ، ئەمانەش کار دەکەنە سەر گەشەی ڕووەك بە نموونە کەمی‌ی توخمی فلۆر زیان بە خێزانی سنەوبەر دەگەیەنێت وە ڕێ لە کرداری دابەش‌بوونو تازەبوونەوەی لق‌وپۆپی ئەو ڕووەکە دەگرێت ، هەروەها ماددەی دی .دی .تی D.D.Tکە بەکاریان‌هێناوە بۆ لەناوبردنی مێشوولەی مەلاریا بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا زانست سەلماندی کە ئەم ماددەیە ئەنجامێکی خراپی هەیە ئەویش پەیداکردنی بەرگری مێشوولە بوو دژی ئەم ماددەیە ، بێجگە لەوەی لە کاتی پرژاندنی ئەم ماددەیە بەزۆر ناوچەداو پاش ڕواندنی ڕووەك لەسەر خاکەکە ئەم ماددەیە دەچێتە ناو ڕووەکەکەوە پاشان لە ڕووەکەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو ئاژەڵەی کە ئەو ڕووەکە دەخوات وە لە ئاژەڵەکەشەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤ ئەویش لە کاتی خواردنی گۆشتی ئەم ئاژەڵانەوە .

**پیس‌بوونی خۆراك :**

هەڵگرتنی زۆر چەشنی خۆراك بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە پلەی گەرمی‌یەکی لەڕادەبەدەر دەبێتە هۆی پیس‌بوونی ئەو خۆراکە بەجۆرەها بەکتریاو گەرای زۆر مێرووی زیان‌بەخش ئەمە جگە لەوەی کە هەڵگرتنی زۆر خۆراکو گەرم‌کردنەوەی بۆ

خواردن دەبێتە هۆی دروست‌بوونی ماددەیەکی ژەهراوی کە پێی‌دەڵێن مۆتاجین Motagen ، وە لە خواردنەوەشدا دەتوانین شەربەتی زۆر لە میوە دروست‌بکەین بەهۆی بەکارهێنانی ماددەی کیمیاوی وەك «رەنگ‌و بۆن»و زۆر ماددەی تر بەبێ ئەوەی میوەکە بەشداری بکات لە دروست‌کردنی شەربەتەکەدا وە لە راستی‌دا ئەم شەربەتانە بریتی‌یە لە رەنگاو کە ئەمانەش کارێکی خراپ دەکەنە سەر ئەندامەکانی لەش‌و خستنەوەی زۆر نەخۆشی وەکو نەخۆشی‌یەکانی گەدەو شێرپەنجە .

**پیس‌بوون بەهۆی دەنگێکی زۆرەوە :**

دەنگەدەنگ بریتی‌یە لەو دەنگانەی کە ئاوازێکی ناسازیانی هەیە کە دەبێتە هۆی پەست‌بوونی مرۆڤ‌و ئاژەڵ . سەرچاوەی ئەم پیس‌بوونەش بریتی‌یە لە قاوقیژەی منداڵ‌و بۆڵەبۆڵ‌و ، زەنگ‌و ، شەمەندەفەرو ، فڕۆکەو ئۆتۆمۆبیل‌و زۆر ئامێری تر ، ئەم دەنگانەش کاردەکەنە سەر کۆئەندامی بیستن‌و ، دەبێتە هۆی زۆر نەخۆشی‌ی سایکۆلۆژی‌و فسیۆلۆژی ، گوێ‌گرانی‌و شلەژاندنی دەمار ، سەربەشە . هەروەها ئەم دەنگە ناسازە کاردەکاتە سەر لێدانی دڵ‌و ، دەنگەدەنگیش یەکەکەی بریتی‌یە لە دیسیبل .

دیسانەوە تەقاندنەوەی چەکی ئەتۆمی‌و نیوترونی دەبێتە هۆی پیس‌بوونی شوێنەوار هەروەك چۆن لە ٦ ی ئابی ١٩٤٥ لە شاری هیرۆشیماو لە ٩ی ئابی ١٩٤٥ دا لەشاری ناکازاگی لەلایەن ئەمەریکاوە چەکی ئەتۆمی‌یان تەقاندنەوە کە کارێکی خراپی کردە سەر دانیشتوان‌و بووەهۆی بڵاوبونەوەی زۆر نەخۆشی‌ی وەك گێری ، ئیفلیجی ، شەلەل ، شێرپەنجە ، کەری‌و زۆر نەخۆشی‌ی تر . وەنەبێت تەقاندنەوەی ئەم چەکانە تەنها کاریگەر بێت بۆ مرۆڤ بەڵکو دیسان کاریگەرە بۆ ئاژەڵ‌و رووەك‌و تۆخمەکانی سروشت ، چونکە لەکاتی تەقاندنەوەدا تیشکێکی زۆر بڵاو دەبێتەوە بەناو هەوادا ئەمەش لەگەڵ هەڵمی ئاوی رووبارەکان تێکەڵ دەبێت‌و لەکاتی باران بارین‌دا دێتە خوارەوەو کاردەکاتە سەر گڵ‌و رووەك‌و ئاژەڵ‌و مرۆڤ بە بەردەوامی هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو لە کۆنگرەی باڵای جیهانی‌دا تەقاندنەوەی ئەم چەکانە قەدەغەکرا چونکە کارێکی دژ مرۆڤایەتی‌یەو شوێنەوار دەرووخێنێ‌و ئەنجامی ئەمانەش وای‌کرد کە دەوڵەتەکان سیاسەتێکی نەخشە بۆکێشراو دابمەرزێنن تا مرۆڤ‌و رووەك‌و زیندەوەرەکانی تر تووشی زیان نەبن‌و ئامانجی ئەم سیاسەتەش لە خزمەتی بەرژەوەندی مرۆڤدایە کە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و رۆشنبیری ئەمەش لەو لایەنانەی کە دەبنە هۆی چاك‌کردنی هۆیەکانی بەرهەم‌هێنان‌و دابەش‌کردن‌و چاك‌کردنی زەوی بۆ کشتوکاڵ‌و دروست‌کردنی خانوو رێگا ، کارەبا ، ئاوەرۆ ، قوتابخانەو زۆر شتی تر .

یەکەم هەنگاوی مرۆڤیش بۆ ئەم نەخشەکێشانە شۆرشی پیشەسازی بوو ئەمیش بەنیازی ئامادەکردنی خانووبەرەو بایەخ‌دان بە سروشت‌و ئامادەکردنی دەزگا کۆمەڵایەتی‌یەکانی وەك نەخۆشخانەو هۆیەکانی گواستنەوەو ناردن‌و هێنانی کەل‌وپەلەوە بوو . هەر ئەم شۆرشی پیشەسازییەش بوو بوو بە هۆی شلەژاندنی دابەش‌بوونی دانیشتوان لە شاردا چونکە زوربەی پیشەسازی‌یەکان لە شاردا هەن‌کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی چالاکی‌ی ئابووری شارو زیادبوونی هەلی ئیش بۆ هاووڵاتیان لەبەر ئەم هۆیە کۆچ‌کردن لەلادێ‌و بوو بە شتێکی باو لە جیهاندا کە بوو بە بارێکی قورس بەسەر دەوڵەتەکانەوە چونکە ئەم کۆچ‌کردنە لە سنووری دیاری‌کراوی شاردا دەچێتە دەرو زۆر گیروگرفت دروست دەکات لەبەرئەوە ئەم دەوڵەتانە سنووریان بۆ کۆچ‌کردن داناو لەگەڵ بایەخ‌دان بە زۆر شتی تر وەك :

١ – دروست‌کردنی شوێن یان شاری پیشەسازی بەپێی رژێمێکی نەخشە بۆکێشراوەوە دەبێت ئەم ناوچەیە ١٠ – ١٥ کم دووربێ لە شار .

٢ – دانانی سنوورێك بۆ کۆچ‌کردن‌و قەدەغەکردنی کۆچ‌کردن بەتایبەتی بۆ جووتیارەکان .

٣ – رووبەری خانووەکان گونجاو بێت لەگەڵ قەبارەی هەموو ئەندامەکانی خێزاندا .

٤ – دابەش‌بوونی بازار بەپێی رێژەی دانیشتوانی گەرەکەکان لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە چڕیی بازار .

٥ – تەرخان‌کردنی زەوی‌یەکی باش بۆ باخچەی گشتی‌و شوێنی حەوانەوە لە هەر گەرەکێکدا .

٦ – دابەش‌کردنی هێڵی گەیاندن – خطوط المواصلات – تا بتوانرێ خزمەت‌گوزاری بە شێوەیەکی ئاسان پێش کەش هاووڵاتیان بکرێ .

٧ – چارەسەرکردنی پاشماوەو زبڵ بە شێوەیەکی تەندروستیانە .

٨ – رواندن‌و پاراستنی رووەك .

٩ – دانانی پاڵێوەرێك «فلتەر» بۆ ئەو دووکەڵەی کە لە کارگەکانەوە بەرزدەبێتەوە تا لە زیانی پیس‌بوونی هەوا دووربکەوینەوەو کەمی بکەینەوە .

# ڤان كۆخ و :

# گەشتی شێتی وخولیایی

● شێرزاد عبدالرحمن ●

سەر لە ئێوارەیەك « ڤان كۆخ »ی هونەرمەند دەستی كردەوە فڵچەو بە پەنجە ناسكەكانی وێنەیەكی كێشا كە بریتی بوو لە كورسی یەك ، مۆمێكی لە ناوەڕاستی كورسی یەكە رەسم كرد . . بە چاوی ماڵ ئاوای دووای سەرنجی دایە تابلۆكەو لەپڕ دەنگی گوللە ئەو ناوەی هێنایە هەژان . . . «ڤان كۆخ»ی هونەرمەند خۆی كوشت ! بەم جۆرە كۆتایی بە ژیانی ئەو هونەرمەندە بلیمەتە هات كە هەموو ژیانی خۆی لە هونەرو گەڕان بەدوای راستی دا دەبینی و . . . دوای ئەوە ناویان نا «شێت» . .

ئەو هونەرمەندەی لە كۆتای ژیانیا شێت بوو ! ! ناوی – ڤان كۆخ – هەموو گۆشەیەكی ئەم جیهانەی گرتۆتەوەو تابلۆ زیندووەكانی لە مۆزەخانەكاندا باوەشیان بۆ دەكرێتەوە ، ئەگەر چی ئەو لە هەموو ژیانی خوی دا تەنیا یەك تابلۆی فرۆشتووە « ئانی بۆش» كە ئافرەتێكی رووخۆش بوو بەدوای تابلۆیەكی گەلێ هەرزاندا ئەگەرا لە سەرەوەی ئاگردان هەڵی واسی ! كەچی ، دوای مردنی «ڤان كۆخ» هەر تەنیا هەندێ لە نووسینەكانی كە بۆ «لیثۆ»ی ناردووە لەلایەن براكەیەوە بە ٤٠ هەزار فرەنك فرۆشراوە ! .

هەموو رەنگ و تابلۆكانی – ڤان كۆخ – بە نرخی گران فرۆشران ، بەڵام ئەو تابلۆیەی كە تەنیا دوو پێڵاوی سەر كورسی یەكە ، كەس بیری لێ نەكردەوە ، كە – ڤان كۆخ – بە نیگاو خۆشەویستی یەكی گەورەوە رەسمی كردبوو . .

بەڵام دوای تێپەڕ بوونی ئەو هەموو ساڵە ، دووبارە دەگەڕێینەوە سەر پێڵاوە بەجێماوەكان و – ڤان كۆخ دڵنیا دەكەین كە تۆزی ئەو هەموو ساڵە لەسەر پێڵاوەكان لاچووە . ئەوەتانێ ئێستا ئەم تابلۆ بەهێزە لەو مۆزەخانە دەگوازرێتەوە بۆ ئەو مۆزەخانەو قوتابییانی دانیشكا بەرزەكانی هونەر لە سەراپای ئەم جیهانە بەرینە لێی دەكۆڵنەوە . . .

باوكی – ڤان كۆخ –ی هونەرمەند لە ناوچەی «جرۆن زاندرت»



دەژیاو کابرایەکی شوانکارەی سادەبوو ، ئەو ژیانە سادەیەی کە «ڤان کۆخ» چاوی تێدا هەڵێنا فێری هێمنی‌یەکی گەورەی کرد ، تەنانەت خەڵکی دەوروپشتی پی‌یان دەگوت « لاوی بێ‌دەنگ» ، چونکە لەوە نەدەگەیشتن کە لەو بێ‌دەنگی‌یە کۆمەڵێ شتی گەورەتر خۆی شاردۆتەوەو کۆمەڵێ پرسیاری نوێ لە مێشکی ئەم مرۆڤە شەیدایەدا دەخولێتەوەو دەیەوێ رۆژێ لە رۆژان بگاتە سەرەنجامەکانیان . . . ئەوان دەیانەویست ببێتە تەنیا پیاوی کەنیسە ، بەڵام ئەو ئەوەی نەدەویست ، بەڵکو دەیەویست ببێتە رۆڵەی هەموو مرۆڤایەتی . . . کەنیسەی لەرووداخرا ، بوو بە فرۆشیاری دوکانێکی بچووک . کە بریتی‌بوو لە تابلۆی هەمەوچەشنە ، بەڵام لەوەش نەمایەوە ، چونکە شاگردێکی راستگۆ بوو مامەڵەی هونەرو راستی لەگەڵ کریاران دەکرد ، نەك بازرگانێتی کردن ، ئەوەبوو لەو کارەش دەرکرا . . .

لە «مۆنمارتر» و «سان گرمان» دەیان پیشانگای هونەری بینی . . بەڵام ئەو لەو بڕوایەدابوو هێچیکیان راستگۆییان تێدا نیەو ناتوانن ئازاری خەڵك‌و خواستەکانیان دەربڕن ، چونکە ناخیان تێدا بەدی ناکرێ‌و دڵێکن کە قەت لێ‌نادەن‌و یەك‌کەوتوون‌و هەر خۆیان دووبارە دەکەنەوەو ناتوانن شتێکی زیندوو بخەنە سەر ژیان .

کەچی «ڤان کۆخ» بە پارەی ئیش کردن‌و هیلاکی بەردەوام رەنگی بۆ تابلۆکانی خۆی دەکری‌و بەنیازی پاشەرۆژ وێنەکێشانی دەکێشاو دەیگوت : « من وا هەست‌دەکەم لە ناوەوە شتێك هەیە گەورەترە لە خۆم‌و لێم تێ‌دەپەرێ ، ئاخۆ ئەو نهێنی‌یە چیە لە ناخم‌دا پەنگ‌دەخواتەوە ؟» . . بەلێ ، ئەوەی لە ناخی – ڤان کۆخ–دا دەخولایەوە تەنیا هونەری راستگۆ بوو ، هەر ئەوەش بوو کە فێری ئەوەی کردبوو بچێتە ناو گێڵگەکان‌و لە خەڵك فێری سادەیی ژیان بێت .

وێنەی پیرەپیاوێکی کێشا کە « رۆلان »ی ناوە ، کە نیشانەی خۆشەویستی – ڤان کۆخ –ی دەرئەبڕی بەرامبەر بە مرۆڤ‌و دەربڕین ژیان ، چونکە نەیدەویست لە راستی ژیان رابکات ، لە کاتێکا کە خۆی کورە هەژارێکی سادەبوو ، تەنانەت نووسینەکانی ئەوە دەردەخا کە گەلێ جار یارمەتی دارایی لە «ثیۆ» وەوە بۆ دەهات .

کەچی ، دوای تێ‌پەڕبوونی چەند ساڵێك بەسەر کۆچی – ڤان کۆخ –دا نووسێنێکی تری کە هەر بۆ «ثیۆ»ی ناردووە لە مێوانخانەی «درۆو» بە ٤٠ هەزار فرەنك فرۆشراوە کە تیایدا لە «ثیۆ» ئەپارێتەوە بۆ ناردنی ٤٠ فرەنك بۆئەوەی پی‌ی بژێت‌و رەنگی تابلۆکانی پی‌بکرێت .

ئەو هونەرمەندە بەرزە ، قەت‌و قەت بیری لە رەنگی «رەش» نەدەکردەوەو نەیدەویست لە هیچ تابلۆیەکی هونەری‌دا ئەو رەنگە رەش‌بینی‌یەی نەدەکێشا ، بەڵکو بەردەوام خولیای تیشکی رۆژبوو . . هەموو کەل‌وپەلەکانی نەیدەکردە سێ فرەنك ، بەڵام هەر بەختەوەر بوو ، چونکە بەلای ئەوەوە ژیان‌و بەختەوەری تەنیا هونەرو راستگۆیی بوو . . ئەوە تا لەدوای مەرگی‌دا دەست‌نووسێکی بەجێما کە دەڵێ : « زۆر جار دەزانم کە بەتەواوی چیم دەوێ . . من بەتەواوی لە ئازار تواومەتەوە ، حەزیش ئەکەم هەموو تابلۆکانم رێزو نوازشت بۆ ئەوانە دەربڕێ کە وەکو من ئازاری ژیان گیرۆدەیانی کردووە» .

– ڤان کۆخ – عاشقێکی گەورەبوو ، بەڵام کەم کەس لە زمانی عەشقی ئەو دەگەیشت ، تەنانەت کاتێ عاشقی « راشیل» بوو ، عەشقەکەی جی‌ی تێ‌رامان‌و سەرسورمانی هەموو لایەك بوو . . رۆژنامەیەك هەواڵێکی بلاوکردەوەو ووتی :

( رۆژی یەك شەمووی رابردوو لە سەعات یانزەو نیوی شەو ، کابرایەك کە ڤانسنت ڤان کۆخی ناوەو نیگارکێشێکی هۆڵەندی‌یە چووە ژووری نهێنی ژمارە یەك‌و داوای دیتنی ئافرەتێکی کرد ، کە چاوی پی‌کەوت راستەوخۆ شتێکی پێچراوی دایە دەست‌و داوای لی‌کرد بشارێتەوەو هەڵی‌بگرێت . . . ئیتر شون بزربو . . کاتێ ئافرەتەکە کردییەوە سەیری‌کرد گوی‌ی براوی تێدایە . . گوی‌یەکەش هی هونەرمەند ڤان کۆخ خوی‌بوو . . . کە پیاوانی پۆلیس بەشوێنیا گەران ، ڤان کۆخیان بینیەوە کە لەبەر ئازاری گوی‌ی لەنێوان مان‌و نەمان‌دا بوو» . .

بەڵام رۆژنامەکە ئەو راستی‌یەی نەدرکاند کە بۆچی – ڤان کۆخ– ئەمەی کرد . . چونکە ئەو بەردەوام بەدوای ئەو ئافرەتەدا دەگەڕا کە دڵی بکرێ ، نەك لەشی . .

زۆریان گوت ، بەڵام ئەو هەر بە بێ‌دەنگی مایەوە ، تەنیا دوکتۆر «جاشیە» توانی ناخی دەروونی دەربڕێ تابلۆکەی مۆزەخانەی «گۆدیۆم» ئەوە روون‌ئەکاتەوە . .

– ڤان کۆخ – زۆری « راشیل » خۆش دەویست‌و دەیەویست قوربانی لەپێناو ئەو ئافرەتە بدات کە تەنیا بە رێکەوت ناسیی . . لە بەر باران دەم‌وچاوی – راشیل –ی لە تۆزو خۆڵ پاك‌کردەوە . . هەموو کەل‌وپەلی خۆی دای . . . هەتا دڵی خۆی . . . هەر باوەری نەکرد . . ڤان کۆخ گوی‌یەکانی خوی لێ کردەوە کەچی ئافرەتەکە ناوی نا -- شێت ! ! بەڵام ئەو شەقامە تەسکەی کە کارەساتەکەی تێدا روویدا ئەمرۆ بووە بە مەنزڵگای هەزاران دڵداری گەورەو لە عەشقی – ڤان کۆخ – دا عاشقانی ئەو سەردەمە خۆشترین ساتی تێدا بەسەردەبەن . . .

کاتێ دوکتۆر – جاشیە – سەری بەرزکردەوە . . بە ئازارەوە ووتی : نا ، خۆت ئازار مەدە ، نیگبەتی‌و مەینەتی لەم جیهانەدا کۆتایی نایەت !

● ئەم نووسینە لە کتێبی « رحلات الحب والجنون» یوسف فرنسیس ئامادەکراوە .

# بــــەراوردێکی بچووك

## نجاة رفیق حلمی

ئەوەی بیستوومانەو دەیبینین ئەوەیە کە ئافرەت لەو وولاّتانەی کە لەشارستانیەتدا پێشکەوتوون گەلێ سەربەستی بەدەس هێناوەو لەگەلێ ئیش و کاردا سەربەخۆ دەجوولێتەوە . ئافرەت لەتەك پیاودا لە هەلّس وکەوت دایە ، هەر لەسەرەتای چوونە قوتابخانەی سەرەتایی تا دوا پلەی زانستگا تێکراو بە یەکسانی لەگەلّ پیاودا دەژی . دوابەدوای ئەو سەردەمەی ژیانی بەلّکو گەلێ پێش تریش بابلّێین لەتەمەنی ١٤ – ١٥ سالّیدا لەکەس وکار کە دایك و باوك و خێزانەکەیەتی جیادەبێتەوەو بەوپەری سەربەخۆیی رادەبوێرێ و هەرچی خۆی بەچاکی زانی و دلّی گرتی سێ ودووی لێ ناکا دەیکاو بۆی دەچێتە سەرو کەس لێی ناپێچێتەوە ، ئەمەو گەلێ شتی تایبەتی تر هەیە کە مەبەست لەووتارەکەمان دا ئەوە نی یە کەباسی بکەین بەلّکو وەك نموونەیەك لەژیانی ئافرەتی دەرەوەو لایەکی بچووکی گرنگ لە رەوشت و رەفتاری ئافرەت دەیلّێین . بەلاّم ئەوەی شایانی باسە ئافرەتانی هەلّخەلّەتاوی ولاّتە پەرەسەندووەکان و ئەوانەی سیمای رۆژهەلاّتیان پێوە دیارەو هەندێ زۆروکەم دیانەت کاری لە رەوشت و رەفتاریان کردووە ئافرەت و پیاو وەك مرۆڤێکی ئەو ناوچەو هەرێمانەی کە پێیان خستۆتە ناوەندی بووژانەوەو پێشکەوتن و رۆشنبیری هاوچەرخ وادەزانن ئەو جۆرە هەلّس وکەوت و رەوشتە ناپەسەندانەی کە ئافرەت لەدەرەوە دەیکات ئەوپەری شارستانی یەت و پێشکەوتنەو هەر هەولّی ئەوە دەدەن لەم بوارەدا لاسایی یەکی کوێرانەیان بکەنەوەو بگەرێن بەدوای ئەو رێگایەی ئەوان گرتوویانە .

هەر کەناوی دەرەوەی سنوور دێت لەبەردەمی هەندێ ئافرەت دا خەیالّ و هیوای ناپاك قوت دەبێتەوەو بەس ، بەلاّم ئەوە لەبیردەکەن کە ئافرەتی زۆرزان و بلیمەت و رۆشنبیرو چالاك و پالّەوان و زاناو پرۆفیسۆرو شارەزای زانستی و هونەرو وەرزش و پێشڕەوو رابەرو ئەفسەرو گەلێ ناودارو ناسراو هەن هەر لەو ، ولاّتانەی کە بەو جۆرە ئافرەتانەی باسمان کردن ناسراون .

ئەوەی شایانی باسەو گەلێ جاز سەرنجی راکێشاوم ئەوەیە کەئافرەت لەدەرەوە سێ جۆر یاخود سێ چین پێك دێنن .



ـَـمـ . ئافرەتی هەرزەکاری بێ‌کار کەزۆربەی ئەو چینەیە کە ـــ هۆی سووکیی ڕەسەنەکەی و ئافرەت بەچاوی سووك ـــرکرێ .

ـیەم . . ئافرەت کە بریتی‌یە لەو چینەی پێی‌دەڵێن ئافرەتی ـــ ەگەڵ پیاودا ، ئەم چینە چ لاو بێ چ بەساڵا چوو ، بریتی‌یە ـ جیەی کەئافرەتی کارکەرو بەکەڵك و سوودبەخش پێك‌دێنێ ، ـ جێگەو دەزگایەك کار بکا هیچ جیاوازی‌یەك لەنێوان ئەوو ـ ـ نی‌یە ، بگرە لەگەڵێ ڕێوشوێن‌دا لەپیاو بەسوود ترە بەتایبەتی ـحـرگاو کارگەو شوێنێ ئیش کردنی دەگەڕێتەوە ماڵێ وەك ـمت ڕۆڵی سروشتی خۆی دەبینێ .

سێیەم . . ئەو جۆرە ئافرەتانەیە کە پەك‌کەوتەن ئەمانەش یاخود ـــ یەکەم پەیدابوون لەپاش ئەوەی کەئافرەتە هەرزەکارەکان ـ ـــ پیر دەبن دەبنە ئافرەتی پەك‌کەوتەو بەجۆرەها نەخۆشی ـ ـ ـعروون و نەخۆشی‌ی کۆمەڵایەتی گرفتار دەبن . تەنانەت ـتی مێشك و دەروون و لەش تێکەڵ بەیەك دەبن و سەریان ـ ـشێێن و بەرەو نەخۆشی کۆمەڵایەتی‌یان دەبەن ، وەك مەی ـ ـعوەی زۆرو بەنگ‌کێشان و کەوتنە سەر شەقامەکان و ـ ـوە بێ‌سەروشوێن یاخود شێتی و نیمچەشێت تاکو دەمرن .

ـرجارەش هەندێکیان لەدەزگایەك کۆدەکرێنەوە کە ـپێی‌دەڵێن خانووی پەك‌کەوتەکان .

ـەڵام ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەو ئافرەتە پەك‌کەوتوانەیە کەـچینی دووەم پەیدابوون یاخود دەمێننەوە ، ئەمانە گەلی بەرێزن چونکە پاش ئەوەی کە لەکۆمەڵ و نیشتمان و خێزاندا سوودبەخش ـبوون و ڕێوشوێنی ڕاستیان گرتۆتەبەرو خێزان و منداڵیان ـیکەوتوەتەوە ، منداڵیشیان ئاسایی دەژین و خێزانەکە پەردەی ـ ئابرووی لەسەر هەڵنەگیراوەو هەر پەیوەندی سروشتی خێزان لەنێوانیاندا ماوە . ئینجا لەوانە دایکی پیرو نەنکی ژیرو خەسووی دڵسۆزیان لێ‌پەیدابووەو سەرەڕای ئەوە کە بەئەرکی ناوماڵێ هەڵدەستن خۆشیان بەگەلێ ئارەزووەوە خەریك کردووە کە بەمنداڵی و لاوی حەزیان‌لێ‌کردوە یاخود خولیای‌بوون و بۆیان نەکراوە تا بیهێننەدی ، لەو ماوەی دوا ساڵانی تەمەنیان دەستی دەدەنێ و خووی پێوەدەگرن و دیسان سەرلەنوێ کەڵکیان بۆ خۆیان و نیشتمانەکەیان دەبێ . ئەم چینە ئەگەر بێتوو لەمێژووی تەمەنی بکۆڵینەوە دەبینین دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساڵانی ١٩٢٠ دوای جەنگی جیهانی یەکەم تاکو ئێستا کە بریتین لەتەمەن درێژەکان ئەگەر مابن تەمەنیان دەگاتە ٦١ – ٦٢ ساڵ ئەمەش جوانترین تەمەنە بۆ مرۆڤ پاش ئەوەی لەکاری میری دەکەوێ و دەس‌دەداتە کاری تایبەتی خۆی وەك ئارەزوویەك دەیگرێتە دەس و کاتی پێ‌دەباتە سەر ، ئەم کارەش بێ‌سوود نی‌یە بەڵکو بێجگە لەسوودی تایبەتی خۆی سوودێکی نیشتمانیشی هەیە .

ئینجا دەبینین لەم تەمەنەدا ئافرەت لەگەڵێ نەخش و نیگارکێشان و خوری چنین و کاری ئاوریشم و داو ڕشتن و پووش و حەیزەران خەریکە هەندێکیشیان لەگەڵێ نەخشی بەردو ، مەرمەڕو ، دار ، یاخود لەگەڵێ کاری قوڕو شتومەکی جوان دروست‌کردن خەریکن . ئەم جۆرە شتانەی باسمان‌کردن ئەو ئافرەتانە دەیگرن بەدەستەوە کەوەکو دەڵێن نەخوێندەوارن ، یاخود لەمناڵی‌دا خوێندنیان تەواونەکردووە ، بەڵام ئەو ئافرەتانەی کەوەختی خۆی وەك مامۆستاو پارێزەرو ئەندازیارو گەلێ جۆری کە دەستی زانیاری‌یان ڕەنگین بووە پاش لێکەوتنیان لەپیری‌دا دەست هەڵناگرن لەکارە سەرەکی‌یەکەی خۆیان بەڵکو بەسەربەستی ، گەلێ ئارەزووی خۆیان دەکەنە داری دەستیان و دەکەونە فێرکردنی قوتابی تایبەتی و وانەیان لەماڵەوە پێ‌دەڵێنەوە ، جگە لەوەش هەندێکیان خەریکی نەخشەکێشان و خوێندنەوەو کتێب‌دانانن یاخود ئەندامن لەکۆمەڵە نیشتمانی‌یەکان‌داو لەگەڵێ جێگا کە پێویستی‌یان بەیارمەتی هەبێ کاردەکەن وەك کۆمەڵەی هەرەوەزی و کۆمەڵەی پاراستنی ساوا یا کۆمەڵەی (دانانی سنوور بۆ زایین) (تحديد النسل) و کۆمەڵەی کاروباری خێزان تگە لەبەشداری‌کردن لە ڕۆژنامەو گۆڤاری تایبەتی ئافرەتان .

ئەم ئافرەتە بەتەمەنانە ڕێیان دراوەتێ کە بەسەربەستی بجوڵێنەوەو چییان لەتوانادا بێ و پێیان بکرێ بیکەن بەڵکو گەلێ یارمەتی دەدرێن لەلایەن دەوڵەت و کۆمەڵەکانەوە بۆ ئەوەی کەڵك لەدوارۆژەکانی ژیانیان وەربگرن و بەخۆشی بیبەنەسەر لەئەنجام دا سوودیان لەگەڵێ لاوو هەرزەکار پتر دەبێ چونکە وانەیان لەتاقیکردنەوەکانیان وەرگرتووەو وانەی سەرکەوتوو بەکۆمەڵ و نیشتمان دەبەخشن .

جا بۆیە ئێمە دەبێ لەم جۆرە ئافرەتانەی دەرەوەی سنوور ووردبینەوەو وێنەی بەراوردکردنمان لەگەڵێ ئەم جۆرە ئافرەتانەدا بێ نەك ئەوەی لەسەرەتادا باسمان‌کرد چونکە ئەو وڵاتەی سەدەها هەنگاوی سەرکەوتووی بڕی‌بێ لەزانستی و شارستانێتی و پێشکەوتن‌دا دەبێ ئافرەت دەستێکی باڵای لەئابووری و کۆمەڵایەتی و هۆشیاری و پەروەردەدا هەبێ کە ببێتە هۆی بەرەوپێشەوە چوون و پێشکەوتنی .

کەهەمووما دەزانین ئافرەت نیوەی کۆمەڵە بەڵکوو لەهەندێ وڵات‌دا لەنیوەی پترە .

# چەپکێك گوڵاڵەی ڕەنگاو ڕەنگ

# لە باخچەی مەتەڵی کوردیدا[١]

– ئۆرخانی غالب –



ماوەی دووسێ ساڵ دەبێت . لەمەیدانی کۆکردنەوەو توێژینەوەی چەند بەشێکی فۆلکلۆردا خەریکین‌و کاردەکەین .

لەوانە دەستەیەك بەیت‌و مەتەڵی فۆلکلۆریمان گەڵاڵەکردووە ئەگەرچی دوور نیە هەندێ کەسانی وەها هەبن بەچاوێکی کەمەوە بڕواننە فۆلکلۆرو بایەخێکی ئەوتۆی پێ‌نەدەن یان هەڵوێست‌و بیرو بۆچوونێکی تریان بەرامبەر بەم جۆرە کارانە هەبێت ، بەڵام ئەمە هیچ لەمەسەلەی ڕاستەقینەی ئەو ڕێڕەوە ناگۆڕێت کە فۆلکلۆر گرنگەو بەشێکی میراتی باو و باپیرمانەو لەهەستێکی پاك‌و بێگەردەوە بەرامبەر کۆمەڵگای کوردەواری هاتۆتە مەیدانەوە .

وەك دەزانن مەتەڵ لقێکی دیارو سەربەخۆیە لەلکەکانی ئەدەبی فۆلکلۆریمان ، ئەگەرچی زۆر مەتەڵمان هەن کێش‌و سەروایان هەیە بەڵام ناچنە ریزی شیعرەوە ، چونکە مەتەڵ سۆزو مۆسیقاو ئیقاعێکی ئەوتۆ شك نابات تاکو بگاتە پلەی شیعر . . نەتەوەکەمان لەم ڕووەوە گەلێك دەوڵەمەندە کەچی لەبواری کۆکردنەوەو ساخکردنەوەو باسکردنی ئەم بەشەی فۆلکلۆرەدا تاکوو ڕۆژی ئەمڕۆ هەوڵ‌و کۆششێکی ئەوتۆ نەدراوە کەشایان‌و پڕ بە پێستی بێ .

ئێستایش بەشێکی ئەو مەتەڵانەی کە لەلای ئێمە دەست دەك کە نو بۆ یەکەمجار ڕووناکی بڵاوکردنەوە دەبینن دەیانخەینە بەرچاوی خوێنەرانی ئازیز بۆ ئەوەی ببێتە هەنگاوێك بۆ هەکوو کوردێکی خاوەن هەست بەگشتی‌و فۆلکلۆریستەکان بەتایبەتی کە پێویستە هەوڵ‌بدەین سامانی دێرینەمان ڕووبەڕووی توێژینەوەی زانستی بکەین .

پەیرەوکردنی ئەمە کارێکی پێویست‌و پیرۆزەو پێچەوانەشی نەك خزمەت ناکا بەڵکو زیانێکی زۆر گەورەی هەیە جا بەهیوای شارەزایان‌و ئەدەب‌دۆستان لەهەر ناوچەیەك هەن‌وسەر بەهەر دیالێکت‌و شێوەی زمانی کوردی بن لەناخ‌و دڵسۆزی‌یەوە ئاوڕێکی لێ‌بدەنەوە .

**مەتەڵەکان‌و ئەنجامیان .**

**مەتەڵ لەچەشنی تاقیکردنەوەی پلەی ژیری کۆمەڵانی خەڵك‌دا .**

**١ – ئەم‌لای گڵ‌و ئەو لای گڵ تێ‌ی‌دایە نەرمکەی دڵ .**

**واتە (ماستی ناو کیتەڵە)**

**٢ – ئەسپی کەس نەتەرانیوو**

لانكى كەس ڕانەژاندوو
باخى كەس نەچەقاندوو .

واتە (با ، قەبر ، بەهەشت)

٣ - ئەگەر عاقڵى ، عەقڵدارى خۆت لەبيرە لەهەموو تەيران چ تەير بەشيرە .

واتە (مشەمە مە كوێرە)

٤ - بە بەرخى سەوزە ، بەكاوڕى سوورە ، بە مەڕى ڕەشە .

واتە ، (ترێ ، توترك . .)

٥ - بەخێشەوە ، بەمێشەوە ، بە خالقى دەروێشەوە ، چت دى پانى لەپێشەوە .

واتە : (دەستى كوللە)

٦ - بەسێ برا دووخێنێكيان هەيە .

واتە : (سێپاى مەشكە)

٧ - چ شتێك هەيە چشتانى ، لەناو بوخچەى سوڵتانى ، خودا نەبێ كەس نايزانى .

واتە ؛ (منداڵى ناوسكى دايك)

٨ - چوار دەچەقن ، دوان دەلەقن ، دوان دەرەقن ، دوان دەزەقن .

واتە : (قاچ و گوێچكەو شاخ و چاوى بزن . .)

٩ - خارێكم هەيە لەزوورگى ، سەر گەورەترە لەهورگى .

واتە : (مێروولە)

١٠ - دارەوەنێ ، لەسەركەنێ ، شێخ و مەلا دەستى پێوە ئەگرێ .

واتە : (لوت)

١١ - زەردەڤى زەوارەڤى ، پێچ‌پێچەى عەوارەڤى .

واتە : رۆنى ناو هيزە

١٢ - ڕايەڵى لەسپيلكى ، تێوەدانى لەسوركى ، برانەوەى لەشينكى .

واتە : (قەزوان)

١٣ - ڕۆڵەى شيرين و شە وێڵە ، دايكى چرچ و چەوێڵە .

واتە : (مێو)

١٤ - سەرجلى ، بن‌جل خورى
ئەگەر هەر نەيبى لەبەر پيرەژنە بۆرێكى مرى .

واتە : كلاڵشى خورى

١٥ - سەگى هار ، كرديە بانى دار ،
پەل و پۆى هێنايە خوار .

واتە : (تەشوێ)

١٦ - لەناو دەردێ ، لەكابانێ هەڵدێ . ؟

واتە : (كوندە)

١٧ - مەلێ هات بەهۆهۆ ، نە تانى هەيە نەپۆ .

واتە : (كوڵەبالێ)

١٨ - مامەكم هەيە لەدەشتێ
سێ‌وسێ تير لەپشتێ

واتە : (سيخور)

١٩ - هەشتى هەنگاوە ، چوارى چاوە ، گڵ‌درەى ناوە .

واتە : (جووت)

مەتەڵ لەچەشنى كات بردنەسەرو سەرلێشێواندن و زمان تەتەڵە پێكردن .

١ - ئاشى سوسێ بەشەوى سێ‌شەممە سووتا .
٢ - ئەم چل چنگە چەڵتووكە لەتۆوى چى چل چنگە چەڵتوكێكە .
٣ - بلە خرە زۆر جل شڕو درە .
٤ - جلى تەڕم كرد لەڕێوى لەڕ .
٥ - چڵە توتركەكە ئەوتۆ چ چڵە توتركێكى بەوبەرەوە .
٦ - چەقەڵى چەمى چەقان ، كەچووم چەڵتوكى چەمى چەقانى ئەتەقان .
٧ - دووگاى لەڕ لەچۆمەكى تەڕ ، قوڵە لەڕ شڵە لەڕى ئەلستەوە ، شلە لەڕيش قوڵە لەڕى ئەلستەوە .
٨ - ڕێوى لەڕ لە لاڕێ ئەلەوەڕێ .
٩ - سێ‌وسێ سيووسيووەى سەربان سيووەسيووى دێ .
١٠ - قازى ماڵى بابى قازى قاوەقاوێتى .
١١ - قالە قيتە قەيتانى قاچى قرتان .
١٢ - كاكە كاكە گاكەى كاكە كاكەى گاكەى كاكەى خوارد .
١٣ - گا كوڵە زەردى لەڕو گا شڵە زەردى لەڕ ئەلە وەڕان لەمێرگێكى خۆش‌لەوەڕ هەرگا كوڵە زەردى لەڕ گا شڵە زەردى لەڕى ئەلستەوە ، هەرگا شڵە زەردى لەڕ گا كوڵە زەردى لەڕى ئەلستەوە .
١٤ - مووى ئەم بەرە تەرە لەمووى چ مەرە لەڕێك براوەتەوە .
١٥ - مەرێ ڕەش لەوەردێ ڕەش
هەر دايكێ دايكم شەكە سەر ڕەش . .

# ● ئایا فەحسی گشتی سالأنە پێویستە ؟
# ● بۆ لای کێ دەچیت ؟
# ● بۆ لای پزیشکە تایبەتیەکەت
# ● یان بۆ لای پسپۆر
# ● یان بۆ نەخۆشخانە
# ● یان بۆ مەڵبەندێکی گشتی پزیشکی ؟

لە گۆڤاری (الجیل)ەوە کراوە بە کوردی



**سەرەتا :**

ئایا بۆ فەحسی گشتی‌ی تەنت سالێ دوو جار دەچی بۆ لای پزیشك ؟ یان پشت‌گوێ‌ی دەخەی ؟ وازان دەکرێ ئەگەر ئەو دایەرەیەی کاری تێدا دەکەی ، یان دەوڵەت لەبری تۆ ئەرکەکە بکێشێ وا بێ‌گومان ئەم جۆرە فەحسە پشت‌گوێ ناخەی ، بەڵام ئەگەر چوونە لای پزیشکی تایبەتیت لەسەر خۆت بێت وا زۆر جار وازی لێ‌دەهێنی ، جا لێرەدا پرسیارێکمان بەرەو روو دەبێتەوە ئاخۆ ئەم جۆرە فەحسە گشتی‌یە سوودی هەیە یان نەء ؟

زانستی پزیشکی ناتوانێ کوتوپڕ وەڵامی ئەم پرسیارە کەوا چەند ساڵێکە مقۆمقۆی لەسەرە ، بداتەوە .

گۆڤارێکی پزیشکی راپۆرتێکی پێش چەند ساڵێك بڵاوکردەوە تیایا نوسرابوو ئەو پزیشکانەی هامشۆکەرەکانی خۆیان هان ئەدەن بۆ فەحسی گشتی ئەگەر جارێکیش بێت لە ساڵێکدا ، هەر خۆیان دەڵێن :

بۆ ئەوانەی کە تەندروستی‌یان باشە ئەم جۆرە فەحسە پێویست نیە ، هەروەها یەکێ لە مەڵبەندە پزیشکی‌یە گەورەکان لێکۆڵینەوەیەکی ئامادەکرد حەوت ساڵی خایاند ، لەم ماوەیەدا راوێژیان بە پێنج هەزار کەس لەوانەی فەحسی سالأنە دەکەن کرد ، وە گفتوگۆشیان لەگەڵ پێنج هەزار کەسی دی کرد لەوانەی تا هەست بە پێویستی چوونەلای پزیشك نەکەن ناچن . لەئەنجامدا دەرکەوت چ جیاوازیەکی گرنگ لە ئەنجامەکانی ئەو دوو کۆمەڵەیەدا نیە .

## «چوار پرسیار»

چوار پرسیاری بنەڕەتی هەیە پێویستە وەڵامیان بدەیتەوە ئەگەر هاتیتە سەر ئەوەی بڕیار بدەی ئەم ئامۆژگاریانەت مەبەسە .

١ – ئایا وا هەست‌دەکەی تەندروستیت باشە ، وە لە حاڵەتێکی دروستی .

٢ – ئەگەر بڕیارت‌دا فەحسی گشتی سالأنە بکەی ، تا چ رادەیەك

ئەم فەحسەت بەراستی گشتی دەبێ؟ ئایا واز لە فەحسی چەوتایی لەش کە ئازاربەخش و ئەرك گرانە دەهێنی ! ، تا چ رادەیەك پزیشکەکەت دەربارەی فەحسی هێزی هەناسەت چاو دەپۆشی بەتایبەتی ئەگەر جگەرە کێشێکی سەرومڕبی .

٣ - تا چ رادەیەك ئەنجامی ئەم فەحسانە راستە؟ ئەگەر ئەنجامی فەحسی شێرپەنجە یان نەخۆشی دڵ لە لایەنی تۆوە نەبوو ، تا چ رادەیەك ئەوە بەڵگەی باوەر پێکراوە کە تۆ تووشی ئەم نەخۆشیە یان ئەویان بووی؟

٤ - بۆ فەحسی گشتی بۆ کوێ دەچی؟ ئایا بۆ لای پزیشکە تایبەتیەکەت؟ یان بۆ لای پسپۆرێك؟ یان بۆ عیادەیەکی پسپۆر کە فەحسی چەندەها لەو خەڵکانەی ریزیان بەستوە دەکات؟

یان بۆ نەخۆشخانەیەکی مەشق یان بۆ مەڵبەندێکی گشتی پزیشکی؟

## «ئاسی گشتی»

زوربەی پزیشکەکان لەسەر ئەوە پێك‌هاتوون ئەم جۆرە فەحسە گشتی‌یە سالآنەیە بۆ هەموو کەسێك پێویست نیە ، مەسەلەی بڕوابوون بە فەحسی بەرودوا سەرنج راکێشە چونکە هەتەرە لەسەر فەحسی رێك‌وپێك بەلآم گرنگ نیە سالآنەبێ ، ژمارەیە لە پزیشکەکان دەڵێن بۆ ئەوانەی لەش ساغن لە تەمەنی سیەکانیاندا زیاتر لە سێ جار فەحسی گشتی یان پێویست نیە ، چوار جاریش بۆ ئەوانەی تەمەنیان لە چلەکانایە پێنج جاریش بۆ پەنجایەکان بەو مەرجەی ئیتر لەوەو دوا بیکەن بە سالآنە . پزیشکەکانی کۆمەڵەی نەخۆشی دڵ و شێرپەنجە لە ولآتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لەو باوەڕەدان ئەم جۆرە فەحسە چ ئەنجامێکی وا بەدەست ناهێنێ بۆ قەلاچۆ کردنی ئەم دوو نەخۆشیە سەرەکیە ، چونکە نیوەی ئەو خەڵکەی تووشی نەخۆشی دڵ بوون فەحسەکانی لەوەو پێشیان ئەوەی دەرنەخستوە کە نیشانەیەکی ئەم نەخۆشیەیان بوبێ ، یان ئەو خەڵکە لەوانەن کە زۆر بایەخیان بە جۆری خواردەمەنی‌یان داوە ، لەوەش ترسناك‌تر ئەوەیە هەندێ جار ئەنجامی ئەم جۆرە فەحسانە هەڵخەڵەتێنەر دەردەچی . موتمانە بە نەخۆش ئەکاو ، واش نابێ . سەرەرای ئەمانە مەسەلەی لایەنە مادیەکەش لەوێ بوەستێ .

هەندێ جاریش ئەنجامی ترسێنەری هەیە . واتە فەحس وای دەرئەخات کە دەماری خوێن‌بەر کرژبوە ئەمەش قابیلی چارەسەرکردنە ، کەچی فەحسەکانی لەوەو دوا ، وای دەرئەخات کە نەخۆشی شێرپەنجە دەمێکە کاری خۆی کردوەو لەوەوپێش لە فەحسەکانا بەدیار نەکەوتوە ، جا ئەم هۆیانە گەلێ جار وایان لە هەندێ کردوە کە قایل نیە تەنانەت فەحسە ئاسایی‌یەکانی وەك پێوانی تەوژمی خوێن و ئەشیعە گرتنیش بکات .

## سوودی هەرەشە سەرەتاکان

هەندێ لە پزیشکەکان دەگێرنەوە دەڵێن . ئاگادارکردنەوە سەرەتاییەکان کە بۆ نموونە وریات دەکەنەوەو پێت دەڵێن ئاگات لە خۆت بە نەخۆشی شەکرت هەیە . ئەم جۆرە ئاگاداری‌یە بێ‌سوود بوە چونکە ٧٠٪ی ئەو جۆرە نەخۆشانە پەیرەوی ئامۆژگاریەکانی پزیشکیان نەکردوە تا بەسەر نەخۆشیەکەدا زاڵ‌بین . هەروەهاش ئاگاداری کردن لە شتێك کە لە دواروژا پەیدائەبێ بێ کەڵکە . بەتایبەتی ئەگەر شتێکی وا نەبوو بوو پێویست بە نەشتەرکاری بکات . زوربەی پزیشکەکان لەو رایەدان نەخۆش لەسەر خۆپاراستن رابهێنرێ . جا چونکە زوربەی نەخۆشەکان لە سەرەتاوە هەست بە لێ‌پرسراوی ناکەن بۆیە پزیشکەکان هەتەرن لەسەرفەحس‌کردنی رێك‌وپێکی سالآنەیان تا بتوانن چ ئاڵوگۆری لە حاڵەتیانا روری‌داوە دەرکی پێ بکەن . بۆ نموونە ئەگەر جگەرەکێشێ رادەی هەناسە وەرگرتنی لە ٨٥٪ نزم‌بوەوە بۆ ٦٠٪ ئەوا بەناچاری ئەبێ واز لە جگەرەکێشان بهێنێ وە رەنگە ئەو نزم‌بونەوەیەش هاندەربێ بۆی تا وهزی لێ بهێنێ .

هەن دەڵێن پێك‌گەیشتنی نەخۆش و پزیشك لە فەحسی ئاسایی زۆر گرنگترە . چونکە رەنگە ئەو پزیشکە هەر لەو چاوپێ‌کەوتنو میوانداریتی‌یەدا سەرەتای نەخۆشیەکی لە میوانەکەدا هەست‌پی‌کردبێ کە خۆی پێی نەزانیوە .

## «ئەرکی گران»

پارەی فەحس و چونەلای پزیشك ئەوەندە گران بوە بە رادەیەکی وا زۆر جار مرۆڤ دەخاتە دودڵیەوە بچێ یان نەچێ؟ جا بۆ نەهێشتنی ئەو بارە نالەبارە زۆر لە دامودەسگاکان ئێستا چارەسەرکردنی فەرمانبەرانیان کردوە بە خۆرایی . بەلآم ئەوەی مەترسی پەیدادەکات زۆر لەو خەڵکە ئیمرۆ بە سبەی . راوێژو پرس بە پزیشك کردن دوا ئەخەن . بەتایبەتی لەنێوان فەحسە گشتیەکانا بەتایبەتیش ئەگەر فەحسی لەوەو پێش دەری‌خستبێ کە خاوەنەکەی باشەو چ جۆرە نەخۆشییەکی نیە .

سەرەنجام دەربارەی مەسەلەی فەحسی گشتی شتێکە تا ئێستا لەسەر بڕیاری مرۆڤ و پزیشکە تایبەتیەکەی خۆی وەستاوە .

# (هەر خانەیەکی مێشك لە کۆمپیوتەر زیرەکترە)

عبدالكريم حسن



ئایا مێشکی ئادەمیزاد کۆمپیوتەرە ؟ زیرەکی چی‌یە ؟ زیرەکی لەکوێدا کۆدەبێتەوەو نەخۆشی‌یەکانی هۆش (عقل) لەکوێوە دێن ؟ بۆچی مرۆڤ لە هەموو گیانلەبەرەکانی تر زیرەکترە ؟ ئایا مرۆڤ دوارۆژ مێشکی پێشکەوتووتر دەبێت ؟ هەموو ئەمانەو گەلێکی تر کۆنگرەی پزیشکی کە لە حەفتەی یەکەمی کانوونی یەکەمی ١٩٨١ لە پاریس بەسترا وەلامی دانەوە ، کەوا (٢٦٠٠) زاناو لێکۆلەرەوە بەشداری‌یان تیا کردبوو ، لە کۆتاییدا گەیشتنە دۆزینەوەی سەیر سەیر دەربارەی مێشکی ئادەمیزاد . رەنگە بپرسین ئایا ئەو شتە نوێیانەی کۆنگرەکە هێنایەکایەوە چین ؟ بێ‌گومان زۆر شتی نوێ لە کۆنگرەکەدا دەرکەوت یەکێك لەوانە روونکرایەوەو پیشاندرا کە دەتوانرێ مێشك لەساتی بیرکردنەوەدا ببینرێت واتە لەوکاتەی کارو فرمانی خۆی دەکات .

پرۆفیسۆر (نیالس لاسین) لە (کۆبنهاگن)ەوە دۆزینەوەیەکی نوێی پیشاندا بریتی‌بوو لە دەزگایەك دەتوانرێت بەهۆیەوە ئاست (منسوب)ی هەلقولانی خوێن لە شوێنە جیاوازەکانی مێشك بپێورێت ، ئەوەش بەتەواوەتی چالاکی‌ی ئەم ئەندامە

دیاری‌ده‌کات . لاسین وای له نه‌خۆشه‌کانی کرد که گیراوه‌یه‌کی تیشکده‌ری گورجکه‌ر radioatif – منشط)هه‌ڵمژن ، ئینجا شوێن ڕێڕه‌وی ئه‌و تیشکه که‌وت له‌ناو بۆری‌یه خوێنینه‌کانی مێشك .
هه‌روه‌ها به‌هۆی ئه‌م ده‌زگایه‌ی لاسین‌و سسته‌مێکی تره‌وه که نزیکه له سسته‌می ( سیکاینر) ده‌توانرێت وێنه‌ی ڕه‌نگاوڕه‌نگ له‌سه‌ر په‌رده‌ی ته‌له‌فزیۆن ده‌رباره‌ی چالاکی‌ی مێشك ببینین . بۆ نموونه له‌گه‌ڵ جووڵانه‌وه‌یه‌کی که‌می ده‌ستدا چه‌ند پنتکه ڕووناکی سوور له شوێنێکی دیاریکراوی مێشك ده‌رده‌که‌وێت .
به‌ڵام له‌کاتی ماندووبوونی مێشك‌دا په‌رده‌که نزیکه‌ی به‌ته‌واوه‌تی ڕووناك ده‌بێته‌وه .
یه‌کێکیش له به‌شداربووه‌کان له‌م باره‌یه‌وه قسه‌ی کردو وتی : له ساڵی (١٩١٠) گالیلۆ به‌هۆی دووربینه گه‌ردوونی‌یه‌که‌یه‌وه هه‌وڵی دۆزینه‌وه‌ی نهێنی‌یه‌کانی ئاسمانی ده‌دا ، به‌ڵام ئیمڕۆ له تواناماندا هه‌یه نهێنی‌یه‌کانی له‌ش له ناوه‌وه‌و له‌کاتی کارکردندا بدۆزینه‌وه . لێره‌دا ده‌بێ ئه‌وه له یادنه‌که‌ین که هونه‌ری ئه‌م دۆزینه‌وه‌یه‌ش ته‌نها نادرێته‌پاڵ کاره‌کانی پرۆفیسۆر (لاسین) به‌ڵکوو له هه‌مان کاتیشدا ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ دۆزینه‌وه‌ی نموونه‌ی جۆراو جۆری سسته‌مه‌کانی (سکاینر)و گه‌لێکی تر له هۆیه‌کانی وێنه‌گرتنی کاره‌باییانه‌ی مێشك که پشت به ده‌زگاکانی کۆمپیوته‌ر ده‌به‌ستن .

## ئایا مێشك کۆمپیوته‌ره ؟

نه‌خێر . مێشك زۆر له کۆمپیوته‌ر ئاڵۆزتره . ڕاسته مێشك وه‌کو کۆمپیوته‌ر شوێنی چوونه‌ژوورو چوونه‌ده‌ره‌وه‌ی هه‌یه ، واته شوێن هه‌یه نامه‌ی پێ‌ده‌گات‌و شوێنیش هه‌یه ئامۆژگاری لێوه ده‌رده‌چێت ، به‌ڵام شێوه‌ی ئیش‌کردنی جیاوازه‌و ده‌توانێت گه‌وره‌ترین بڕ له تێبینی‌و ئاگاداری تێکه‌ڵ بکات به‌جۆرێکی ئه‌وتۆ که ده‌توانین بڵێین هه‌ر خانه‌یه‌کی مێشك (نیرۆن) کۆمپیوته‌رێکه .
مێشك زیاتر له سه‌د ملیار (نیرۆن)ی تێدایه ئه‌مه‌ش به‌ته‌واوی ڕاده‌ی ئاڵۆزیی مێشك ده‌رده‌خات .
تا ئێستاش دارشتنی بیروڕایه‌کی وورد ده‌رباره‌ی مێشك گه‌لێك کۆسپ‌و ته‌گه‌ره‌ی له‌ڕێ دایه .
پێش چه‌ند ساڵێك وا دانرابوو مێشك بریتی‌یه له مه‌ڵبه‌ندێکی ئه‌لیکترۆنی چونکه پێشوازی له‌ره‌ی کاره‌بایی ده‌کات‌و ده‌ریشیان ده‌په‌ڕێنێت .
هه‌روه‌ها به‌جۆرێك ڕوون‌کرابۆوه که مێشك بریتی‌یه له کارگه‌یه‌کی کیمیکی . لێره‌دا گه‌لێك مادده هه‌ن له‌لایه‌ن مێشکه‌وه ده‌رده‌درێن ، ئه‌مانه‌ش ده‌بنه‌هۆی به‌رده‌وام‌بوونی ئیشکردنی مێشك‌و پێ‌یان ده‌گوترێت هۆیه‌کان (الوسائط) . له‌م ده ساڵه‌ی دواییدا ژماره‌یه‌کی زور له‌م ماددانه دۆزراونه‌ته‌وه‌و سیفه‌ت‌و پێکهاتنیان ڕوون‌کراوه‌ته‌وه به‌تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی سه‌ربه‌و کۆمه‌ڵه‌ن که پێ‌ی ده‌گوترێت ( بیبتید) .
ئێستا زاناکان هه‌وڵ‌ده‌ده‌ن ووردترین شێوه‌ی ئه‌و ماددانه‌بزانن چونکه وا داده‌نێن باشترین خاڵی ده‌ست پێ‌کردنه بۆ تێگه‌یشتنی ئیش‌کردنه ووردکه‌ی مێشك . له‌کونگره‌که‌دا پرسیارێك ده‌رباره‌ی زیره‌کی کرا به‌ڵام که‌س به‌گه‌رمی به‌ده‌نگی‌یه‌وه نه‌هات ، به‌ڵام لێکۆڵینه‌وه‌کان پێشانیان داوه زیره‌کی‌و بیرکردنه‌وه په‌یوه‌ندی‌یان به‌کرداری فیزۆکیمیکی ناو مێشکه‌وه هه‌یه . هه‌روه‌ها په‌یوه‌ندیی نێوان ڕووداوه کاره‌بایی‌یه‌کانی مێشك‌و زیره‌کی‌یان ڕوون‌کردوه .
پرۆفیسۆری ئه‌مه‌ریکایی ( فینك ) ئه‌م ده‌زگایه به شۆڕشێکی ڕاسته‌قینه‌ی ته‌کنۆلۆژیا له‌قه‌ڵه‌م ده‌دات‌و ده‌ڵێت هه‌ر به‌هۆی ئه‌م ده‌زگایه‌شه‌وه له دوارۆژدا ده‌توانرێ هاوسه‌ری به‌ختیار له‌نێوان زانستی فرۆیدو تاقیکردنه‌وه بێ‌لایه‌نی‌یه‌کانی هه‌شتاکان ، ئه‌نجام‌بدرێت .

## نه‌خۆشی‌یه‌کانی هۆش ؟

دوکتۆره ده‌روونی‌یه‌کان ئێستا گومانیان له‌وه‌دا نی‌یه که سه‌رهه‌ڵدانی هه‌ندێ له نه‌خۆشی‌یه‌کانی هۆش به نموونه (شیزۆفرینیا) بۆ شێواویی له کیمیکه کارگه‌ی مێشك ده‌گه‌ڕێته‌وه . فه‌رهه‌نگه ده‌روونی‌یه‌که‌ی (نۆر بیر سیلامی)ش ئه‌وه دووپات‌ده‌کاته‌وه به‌و باسه‌ی له‌ژێر ناونیشانی ( شیزۆفرینیا )دایه‌وه ده‌ڵێت : « شیزۆفرینیا له ئه‌نجامی نارێکی‌یه‌کی زگماکی‌یه‌وه دروست‌ده‌بێت که ئه‌وه‌ش وا له ڕێبازه بیۆکیمیکی‌یه‌کان ده‌کات ناسروشتی بن » .
زۆربه‌ی دوکتۆره ده‌روونی‌یه‌کان هه‌ر له سه‌رده‌می پزیشکی ده‌روونی (ناتان کلاین)ه‌وه تا ئێستاش نه‌خۆشی‌یه‌کانی ده‌مار به‌گوێره‌ی هۆیه بیۆکیمیکی‌یه‌کانه‌وه پۆلێن ده‌که‌ن .
به‌ڵام ئه‌مه‌ش ئه‌وه ناگه‌یه‌نێت که ئه‌و پزیشکی‌ی ده‌روونی‌یه نوێ‌یه ئه‌و بیروڕایه به‌درۆناخاته‌وه که ده‌ڵێن نه‌خۆشی‌یه‌کانی هۆش له ئه‌نجامی هۆیه نابیۆکیمیکی‌یه‌کان په‌یداده‌بن به‌ڵکو هه‌موو دوکتۆره ده‌روونی‌یه‌کانیش له‌سه‌ر ئه‌مه ڕێکه‌وتوون سه‌ره‌تا به پرۆفیسۆر (بیلسێه دی نیکر)ه‌وه که سه‌ره‌ڕای په‌رۆشی بۆ دۆزینه‌وه‌ی نوێ ڕایگه‌یاند که گرنگترین شت لای ئه‌و بۆ چاره‌سه‌رکردنی نه‌خۆشی‌یه‌کانی هۆش په‌یوه‌ندی‌کردنی ڕاسته‌وخۆیه له‌گه‌ڵ

نەخۆشەکان خۆیان . هەروەها لە کۆنگرەکەدا ڕاگەیەندرا کە پرۆفیسۆر (دیویاد دوترخت) ماددەیەکی لەناو مێشك دۆزیوەتەوە ناوی (تیرگاما ئەندورفین)ە تەندروستی ئەو کەسانەی نەخۆشی (شیزۆفرینیا)یان هەیە باش دەکات . لەم بوارەشدا لێکۆڵینەوەکان هێشتا بە ئەنجامی ڕاستو ڕەوان نەگەیشتوون .

بەڵام لێکۆڵەرەوەکان توانیان ئەو شتەی یادگاری لە مێشك ڕێكدەخات جیابکەنەوەو ناوی بنێن (یادگە – الحافظة) ئەو یادگەیەش یادگارییەکانی ناو مێشك ڕێكدەخات بۆئەوەی بەبیرهاتنەوەیان ئاسانبێت . هەروەها شوێنی ئەم یادگەیەش لەناو دەزگایەکە پێیدەگوترێت (ئیبوکامب) . ئەگەر ئەو دەزگایە نەبێت دەتوانین بڵێین یادگاری لە پەرتوکخانەیەکی گەورە دەچێتو پەڕاوەکانی ڕێكنەخراوە واتە پەڕاو دۆزینەوە تیایدا گرانە جا لەبەرئەوە لە توانادا نییە یادگاری بەبێ ڕێکخستن بیرخۆمان بێنینەوە .

## چۆن مێشك گەشە دەکات ؟

مێشك لە ئاستی خانە گەشە دەکات ، مێشکی ئادەمیزادیش بە خێراییەکی سەیر گەشەدەکاتو پەرەدەسێنێ ئاولەمە (جنین) لەناو منداڵداندا لە هەر خولەکێکدا چەند ملیۆنێك نیرۆنانی نوێ بەدەستدەهێنێت . ئەم خانانەش ڕێكدەخرێن بەگوێرەی ئەو وزە خۆرسك (الطاقة الفطرية)ەی کە ڕەگەزی ئادەمیزاد لەلایەن کارتێکردنی چەند توخمێکی دەرەکییەوە وەریدەگرێت .

بەشێوەیەکی ووردتر دەڵێین دەوروبەر هیچ شتێك ناهێنێتەکایەوە بەڵکو دەبێتەهۆی ڕێکخستنی ئەو خانانە بەشێوەیەکی دیاریکراو .

لەم دواییەدا بۆچوونێکی تر سەری هەڵداوە دەڵێت : لە ماوەی کرداری گەشەکردنی مێشکدا نیرۆنەکان هەموویان دەست بە بەرامبەرکێی یەکتر دەکەن تا ماددەیەك بکەنە سەر خانەکانی لەش بۆئەوەی یارمەتی گەشەکردنیان بدات . ئەو ماددەیەش کارگێڕی دەمارەگەشەیەو بە NGF هێما دەکرێت . لەلایەکی ترەوە بەرامبەرکێی نێوان ئەو گەرد (جزيئة)و خانانە دەبێتەهۆی ئەوەی هەڵبژاردنێکی سروشتی بەهێز ڕووبدات هەر ئەمەشە دەمارە دەزگای مرۆڤ زۆر ئاڵۆز دەکات .

## ئایا مێشك بەرباد دەبێت ؟

بەڵێ بێگومان زۆر جار لەگەڵ پیربووندا پشێوی تایبەتی لە هۆش سەرهەڵدەدات – سەرەڕای ئەوەش مرۆڤ لە هەر ساڵێکدا نزیکەی ملیۆنێك (نیرۆن) وونده‌کات . بەڵام ئەم وونکردنە بەشێوەیەکی گەورە زیان بەخش نییە ، چونکە ژمارەیەکی زۆر گەورە لەم خانانە لامان دەمێنێو لە هەمان کاتیشدا ئاسایی ئەو خانانەی دەمرن لاوازترین خانەن ، لەراستیشدا مردنی ژمارەیەك خانە دەبێتە هۆی زیادبوونی چالاکیی خانەکانی تر ، ڕوودانی ئەم دیاردەیەش لە مێژووی پەرەسەندنی ڕەگەزەکاندا ناوەستێ .

دیسان ئەمەش دەبێتەهۆی ئاڵۆزبوونی دەمارەدەزگا . ئێستاش ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە ، ئایا بۆچی مرۆڤ لەهەموو گیانلەبەرەکانی تر زیرەکترە ؟

لە وەڵامدا دەڵێین چونکە کرداری هەڵبژاردنی سروشتی لە ڕێگەی کرداری زگماکیی لە باپیرانەوە دەرفەتی پەرەسەندنی زیرەکیی بۆ ئادەمیزاد ڕێكخست . لەماوەی ملیۆن ملیۆن ساڵیشدا نەوەکان نەوەی لەخۆیان زیرەکترو ڕێكوپێکتر بەرهەمدێنن ، لەم ماوەیەشدا قەوارەی مێشك گەشەدەکات بەشێوەیەکی ڕێكوپێك ، هەروەها ئەو دوو بەشەی مێشك پێكدێنن لە مەسەلەی جۆراو جۆردا تایبەتمەند دەبن ، ئەمەش بوو بەهۆی زۆربوونی تواناکانیان . بەشێوەیەکی گشتی بەشی چەپی مێشك بەزۆری کرداری بیرکردنەوە ڕادەپەڕێنێو بەشی ڕاستیش بەزۆری بەشداری لە کرداری هەڵچوون ( انفعال ) دەکات . بەڵام تایبەتبوونی هەر بەشێك بەتەواوەتی نییە . هەروەها داهێنانی زمانیش ڕێخۆشکەر بوو بۆ پەرەسەندنی مێشك بەخێرایی لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی قسەو گفتوگۆ لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر .

## ئایا دەتوانین ئیشکردنی مێشك چاكبکەین ؟

بەڵێ بێگومان . ئەویش بەهۆی ڕژێمی ژیانی تاکڕەوی (فردية)و ڕاهێنان ، هەروەها بەهۆی چارەسەرییە پزیشکییەکانەوە ، وەکو لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی هۆشدا . بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە زیرەکییەوە هەبێت تا ئێستا هیچ دەرمانێك بۆ زیادکردنی چالاکییەکەی نەدۆزراوەتەوە .

بەم بۆنەیەوە ئێستا هەوڵدەدەن دەرمان بگرنەوە بۆ ئاسانکردنی فێربوون لە ڕێگەی باشکردنی ئیشی بیرەوەری (الذاكرة)یەوە ، (سولومون سیندر) یەکێکە لە شارەزایانی ئەمەریکا لەم ڕووەوە دەڵێت : یەکێك لە ماددەکانی کۆمەڵەی (بیتید) کە مێشك دەریدەدات ناونراوە (ڤازۆبرسین) کار لە بیرەوەری دەکات ، ئەویش وەکو ماددەکانی تری (بیتید) لە گەشەکردنی فزیۆلۆژی بەشداریدەکات ، ئەم ماددەیەش ژێرمێشکە (الغدة النخامية) دەریدەدات وەك هۆرمۆنێك کە پاڵەپەستۆی خوێنو پاڵەپەستۆی ئاو لە گورچیلەکاندا ڕێكدەخات .



**ئامێرە زیرەکی :**

مەبەستمان لە (ئامێرە زیرەکی) زیرەکی ئەو ئامێرانەیە کە ئادەمیزاد دایهێناون وەکو کۆمپیوتەر ، لەوانەیە زیرەکی ئەم ئامێرانە پێش زیرەکی ئادەمیزاد بکەوێت بەلاّم ئێستا شتی وا لە ئارادا نی‌یەو لە دواڕۆژیش ئومێدێکی ئەوتۆی لێ‌ناکرێ ، چونکە ئەوەی نەیدەینێ شتێکی دی لێ بەدی‌ناکەین . جگە لەوەش کۆمپیوتەرەکان لە تاقیکردنەوەیان بەرامبەر یاریکەرەکانی شەترەنج سەرنەکەوتن هەرچەندە لەراستیشدا مرۆڤ زانیاری‌یەکی فراوان‌و تەواوی دەربارەی هەموو خانەکانی شەترەنج نابێت‌و تەنانەت بە ووردی چاودێری هەندێ لە پارچەکانی سەر تەختەی شەترەنجەکە دەکات ، بەلاّم لە کۆمپیوتەریش زیرەکترە ، بۆ سەلماندنی ئەمەش کۆمپانیای (سنترال داتا) دەستی‌کرد بە پەرەپێدانی ئەو بەرنامەیەی کە بۆ دەزگای شەترەنجە ئەلەکترۆنی‌یەکانی دانابوو ئەو بەرنامەی دوایش ناونرا ( تشیس ٤ و ٩) . دوابەدوای ئەمەش بەرنامەی (تشیس ٤ و٦) دانرا . ئینجا هەمان کۆمپانیا لە ساڵی (١٩٨٠) دەورەیەکی ڕێکخست‌و تیایدا یاری لەنێوان شەترەنجە کۆمپیوتەرو چەند یاریکەرێك ئەنجامدراو ڕادەی زیرەکی‌و بێ‌توانایی کۆمپیوتەر دەرکەوت .

هەروەها لە یەکێ لە یاری‌یەکان یاریکەرەکە شلی بە کۆمپیوتەرەکە کرد تا قەلاّیەك‌و شاکەی فەوتێنرا بەلاّم لە کۆتایشدا تەنها بە جوولاندنی داشێك یاری‌یەکەی بردەوە .

لە دەورەی ناوبراویشدا (١٢) یاریکەر توانیان سەر لە کۆمپیوتەر بشێوێنن‌و لێی ببەنەوە . سێ لەو یاریکەرانەش لە ماوەیەکی کەم یاری‌کەیان بردەوە ئەمانیش ناویان میشال کۆنستانێن ، میشال رینییە دیسەونت و جوزیە جیوڤانی ، بوون .

دیسان پاڵەوانی جیهانی پێشووی شەترەنج ( بوریس سباسکی) توانی لە ماوەی (١٨) خولەك‌و تەنها بە گەڕانی (٢٨) داش لە کۆمپیوتەری (تشیس ٤ و ٩) بباتەوە . .

(ج .ب .بۆ)ش یەکێکە لە شارەزایانی (ئامێرە زیرەکی) دەڵێت : ئادەمیزاد هەر لە کۆنەوە خەوی بە سێ شتەوە دەدیت : یەکەمیان خەوی برۆمیثیۆس (خوای ئاگری یۆنانی‌یەکان) بوو کە بتوانێ بەسەر ئاگردا زاڵ‌بێت‌و نهێنی‌یەکەی ئاشکرا بکات ئەمەش توانرا بەدەست بهێنرێت بەهۆی کوورە ئەتۆمی‌یەکانەوە . دووەمیان خەوی ئیکارۆس (مرۆڤێکی ئەفسانەیە دووباڵی بۆخۆی دروست‌کربو توانی بەهۆیانەوە بفرێت‌و لە بەندیخانە ڕابکات)بوو ، ئەمەش هاتۆتەکایەوە بەوەی مرۆڤ دەتوانێ بەرەو ئەستێرەکان بفرێت سێ‌یەمیانیش خەوی توانای گەورەو دروست‌کردنی زیرەکی‌یە کە ئێستا مرۆڤ لە قۆناغە سەرەتایی‌یەکانی دایە .

# زانستی خۆناسین دەبێتە ڕابەرت

نووسەری : ڕێجینالد وایلد
خاوەنی نووسراوانی "تەندروستی و نەخۆشی و زانستی خۆناسین" و "خوداناسین لە چاوی زانستی خۆناسینەوە" وە هی تر
کوردی نووسی : شاکر فەتاح

- دەتەوێ خۆت بناسیت ؟
- دەتەوێ لە ژیانی ڕۆژانەتدا کەڵك لە زانستی خۆناسین وەربگریت ؟
- دەتەوێ بزانیت هۆشی شارراوە چۆن دەکەوێتە گەڕ ؟
- بەپەرۆشەوەیە ژیانێکی خۆشی وا ڕابوێرێت کە شایانی خۆت بێ ؟
- بەتەنگەوەیت کە سایەتییەکی ناوازە بۆ خۆت بهێنیتە بوون ؟
- ئەگەر ئەمانەت دەوێ ئەم نووسراوە ، تا دەتوانیت بخوێنەرەوە .



## پوختەی بەش

١ – ئەوە خراپە کە هەموو سۆزێك بەربەست بکرێ. چونکە سۆز، ئەو هێزەیە کە پاڵ بە ژینەوە دەنێ. لەوەیشدا، لە سۆز گەورەتر نیە.
٢ – بەڵام ناشێ سۆز بەرەڵلابکرێ. پێویستە هەستەکان بەدەست هۆشەوە بێت، باشیش ئاراستەیان بکات.
٣ – دەبێ ئامانجمان ئەوەبێ، کە بە ڕۆشنی بیربکەینەوە، هەروەها بڕیاریش بدەین کە بۆ چ ئامانجێك ڕەنج بدەین لە ژیانماندا؛ ئەویش بۆ ئەمەی کە بە سۆزێکی بەتینی تاسەرەوە ئەو فرمانانانەی لەسەرمانن بەجێیان بهێنین.
٤ – نابێ خۆمان بکەینە بەندە، بۆ هیچ سۆزێك. لە توانایماندا هەیە کە جۆرە سۆزێکی تایبەتی بۆ خومان پەروەردە بکەین، هەروەك ئەوەبێ کە جورە دۆستێکی تایبەتی بۆ خومان پەروەردە دەکەین.
٥ – بە چاکترین سۆزەوە بژی. چونکە ئێمە وا دادەمزرێین و گەشەدەکەین، کە هەست دەکەین دادەمەزرێین و گەشەدەکەین.

### هێزی ویستن بەلای زانستی خۆناسینەوە،
### ئاخۆ دەتوانیت بڕیاری نیاز بدەیت؟
### (٤)

لەم بەشەدا. دەست دەکەین بە لێدوانی رووی سێیەمی ژیانی هوش: «هێزی ویستن». مەبەسمان لە «هێزی ویستن» ئەو کردەوەیەیە، کە بەهۆی ئەوەوە، هۆش، یەکێك لە دوو یاخود سێ فرمان هەڵدەبژێرێ، بۆ ئەمەی لە پاشدا ئەو فرمانەی هەڵیبژاردووە جێبەجێی بکات، ئایا زانستی خۆناسین، چیی لەباردا هەیە، کە پێشکەشی بکات بۆ کەڵکی بابەتی «ویستن»؟

زۆر کەس لەبابەت «ویستن»ەوە دەدوێن، وەك بە تەواوەتی لە سوروشتی مرۆڤایەتیی ئاسایی یەوە دووربێ، وای سەیردەکەن. کەچی لە ڕاستیدا، «ویستن» شتێکی سوروشتی یە، وەك بیرکردنەوەو دەروون.

هۆش بۆ ئەوە دوروستکراوە، کە بیەوێ و نیازبکات.

من ئەمە بۆیە دەڵێم، چونکە زۆر نووسراو هەیە، بایەخی داوە بە هەموو جۆرە مەشقێکی ئەندێشەیی، کە پێشنیازکراوە بۆ شاگردان، فێری بەهێزکردنی وێستنیان دەکات.

بۆوێنە، لە شاگرد داوادەکرێ: گلۆڵە موویەکی لوول دراو، تێك بداو بئاڵۆزێنێ، تا، تاڵەکانی لەیەك دەئاڵێن و گرێیان تێدەکەوێ. پاشان لێی داوادەکرێ: بە نەرمی و ئارامەوە، ئەو تاڵە ئاڵۆزاوانە لە یەك جوێبکاتەوە، گرێ کوێرەکانیان بکاتەوەو گلۆڵە مووەکە بە ڕێك و پێکی، وەك خۆی لێبکاتەوە. ئەمەش کەم روونادات، کە لەو جۆرە نووسراوانەدا، هەندێ مەشقت چاوپێبکەوێ، کە لە شاگرد داوابکات «هەندێ نۆك» بخاتە ناو شووشەیەکەوە بۆئەمەی پاشە جار، بە ئارامێکی وەك ئارامی ئەیوبی پێغەمبەرەوە، دەنگ بە دەنگ، نۆکەکان لە شووشەکان دەربهێنێ و بیانژمێرێ و بەراوردیان بکات. ئەم جۆرە مەشقانە، ڕەنگە رامان بهێنن بە ئارام گرتنەوە، بەڵام کەم بەکارمان دێن لە بەهێزکردنی «ویستن» دا.

لە کۆڕی «ویستن» دا، وا چاکترە، پیاو خۆی لە کارەساتی ژیان و ڕووداوی پەسەندداا ڕابهێنێ. چونکە ڕووداوی ژیان، بۆ پەروەردەکردنی «ویستن» بەکەڵك ترە، لە مەشقی خۆ هەڵبەست و دوور لە ڕووداوی ژیانەوە. چونکە ئێمە لە هەموو ڕۆژێکی ژیانماندا، «ویستن» بەکاردەهێنن. هیچ ڕۆژێك نیە، بڕیار نەدەین لەسەر شتێك لە بریتیی شتێکی تر. هیچ ڕۆژێك نیە ئەمە بە هەزار جاریان پتر نەینوێنین. ئێمە چونکە بەوانەوە ڕاهاتووین، پێ نازانین کە ئەوانەیش، هەموویان، بریتین لە جۆرە: «ویستن» یك.

ئێمە بیر لە «ویستن»ی خۆمان ناکەینەوە، ئەو کاتە نەبێ کە خۆمان لە ئیستێکی وادا ببینین، کە ناچاربین دەست بکەین بە «هەڵبژاردن»ێکی گەورەو سامناك، بەڵام ژیانی ڕۆژانەی ئاساییمان، هەلی وامان بۆ هەڵدەخات، کە بتوانین لەو ڕووداوەدا کە هەیە «ویستن»ەکەمان مەشق پێبکەین.

ڕاستی‌یەکی تریش هەیە ، ئەویش ئەوەیە کە «ویستن» یاخود «خواست» شتێکی مرۆڤایەتی‌یە . گیان‌لەبەر ، تا ئەندازەیەك بیردەکاتەوە ، بێ‌گومان هەست بە شتیش دەکات . بەڵام وا دەردەکەوێ ، کە هێزی خواستی نەبێت . یاخود هێزێکی خواستی کەمی هەبێت ، هەندێ هۆی وا دێتە پێشەوە ، کە پاڵی پێوەدەنێ بۆ فرمان بینین . تەنانەت منداڵیش ، هێزێکی خواستی زۆر کەم نەبێ ، نیەتی . بەڵام کە دەگەینە تافی پیاوەتی ، وامان لێ‌دێ ، کە بتوانین خواستێکی تەواو بەکاربهێنین ، کە ئەگەر بمانەوێ ، دەتوانین بەهۆی ئەوەوە ، زاڵ‌ببین بەسەر ئەو جۆش‌و خرۆشانەدا کە دەمان‌بزوێنن ، هەروەها دەتوانین بە سایەی تێکۆشانێکی کەمی خواستەوە ، ئەو ڕێگایە هەڵبژێرین کە دەمان‌بات بۆ فرمان‌کردن . چۆن دەتوانین هێزی ویستنی خۆمان گەشەپێ‌بکەین ؟ وەرام ئەوەیە : پێویستە مەشق پێ‌بکەین ، بیخەینە گەڕ ، هەتا خواستەکەت بخەیتە گەڕو مەشق پێ‌بکەیت ، ئەوەندە گەشەدەکات‌و بەری لێ وەردەگریت ، هەر سەرکەوتنێك لە کۆڕی خواست‌دا ، دەست‌بکەوێ ، سەرکەوتنی دوای ئەو سووك‌ترو ئاسان‌تر پێك‌دێ .

ئەمەیش ئەوە ناگەیێنێ هەرچەند گیروگرفتێك بێتە پێشەوە بام پڕوپووچیش بێ ، ئێمە هەموو هێزە گەورەکانی خواستی بەرامبەر بوەستێنین . نەء ! ناشێ ئەوە بکەین ! بەڵکو دەبێ بۆ هەر کەینەو بەینەیە ، ئەوەندەی ئەندازەی خۆی ، خواستی تێدا بەکاربهێنین . ئەو پیاوەی لە چایخانەیەکدا دادەنیشێ‌و تا دەمێکی پێنج ووردیلەیی ، هەر بیردەکاتەوە لەوەی ئەم شیرینی بخوا یان ئەو شیرینی ، خواستەکەی خۆی باش ڕاناهێنێ بە مەشق بەکەڵکەوە ، بەڵکو بۆی هەیە بەم کردەوەیەی کاتی خۆی بدۆڕێنێ . نابێ بهێڵین کەل‌وپەلی هۆش ، گرمەگرم‌و تەقو هوورێکی زۆر گەورە لە گوێمان‌دا دوروست‌بکات . خۆخەریك‌کردنمان بە خواستەوە ، لەم شێوەیەدا ، کە پڕە لە سامناکی ، بە کەڵکی گەشەکردنی ئەو نایەت ، بەڵکو بەپێچەوانەوە ، دەبێتە هۆی سەرلێ‌شێواندنی .

ئەو شیرەتەی لە هەردوو بەشەکەی پێشوودا پێشکەشم‌کرد ، ئەگەر فرمانی پێ بکرێ ، لە توانایی‌دا هەیە ، کاری خواست زۆر ئاسان بکات . ئەگەر توانیمان ، چاومان ڕابهێنین بە تەماشاکردنی ژیانەوە ، لە شێوەیەکی* روون‌و ئاشکرادا ، هەروەها بە هۆشێکی مەندانەوە بڕیارەکانمان بدەین لەبارەی ئەو ئاواتانەوە کە هەڵدەگرن ڕەنجیان بۆ بدەین ، پاشان هەرچی سۆزو دەروونێکیشمان هەیە ئاراستەی ئەوانەمان کرد ، کردەوەی خواست تا ئەندازەیەکی گەورە لە خۆیەوە دەبێتە کردەوەیەکی سوروشتی‌ی شارراوە لە ناخی هۆش‌دا .

بیربکەرەوە لەوەی کە پێ‌ی دەڵێین «کردەوە» . مەبەستمان لە کردەوە ، ئەوەیە . کە جۆرە خۆڕاگرتنێك‌و جۆرە دامەزراوی‌یەکی تێدابێ . پیاوی خاوەن کردەوە دووڕوو و دەمدەمی نیە . زۆر جاری وا هەیە ، پێت‌دەکرێ بزانی . لەو کاتەدا کە تێ‌ی کەوتووە ، چی‌ی لەدەست دەوەشێتەوە .

پیاوی دەس‌پاك ، هەرگیز ، بەبیریدا نایەت دزی بکات . لێرەدا ، خواستەکەی ، هەر لە خۆیەوە . دەکەوێتە گەڕ . ئەو لەپێناو ئەوەدا هیچ خۆی ماندوو ناکات .

هەروەها ئافرەتی داوێن‌پاك ، لە ڕێگای داوێن‌پاکی بەولاوە ، ڕێگایەکی تری پێ ناگیرێ . داوێن‌پاکی دەنووسێ بە ڕەووشت‌و خوویەوە ، هەرگیز لێ‌ی‌نابێتەوە ، خواستەکەیشی وای لێ‌دێ کە بە ئاسانی‌و ڕەوانی بۆ لای پاکی‌یەوە ئاراستە بێ دەبێ ، ئەوە ، هەمووی ، بەو جۆرە بێ . شکانەوەو دەنگەدەنگی گوێ‌ی کەرکەر ، بە چاکە نازمێرێ بۆ ماشینێکی کاروفرمان . ماشینی کارگوزار ، ئەوەیە کە بە شیرینی‌و نەرمی‌یەوە بکەوێتەگەڕ . خواستی ئێمەیش ، ئەو کاتە بە چاك دادەنرێ ، کە بە ئاسانی‌و دامەزراوی‌یەوە بڕیاری ئەو شتانە بدات ، کە بە ئاواتەوەیە ، لە دەمی هەرە چاك‌و هەرەپاك‌دا ، بڕیاریان لەسەر بدات ، ئەم واتەیەش دەمانگەیێنێتە جێگایەکی تر . لەپشت هەموو کردەوەیەکی خواستەوە ، پەی‌بردنی تەواوی خۆمان هەیە ، بە خۆمانی بێ‌هاوتاوە ئەو «خۆ» یەی کە دەمانەوێ وا بین . کەواتە ، هەر جارێ ، کەوتینە سەر ئەوەی یەکێك لە دوو فرمان هەڵبژێرین ، پێویستە ئەو تاکەیان هەڵبژێرین کە لەگەڵ «خۆی بێ‌هاوتا» مان‌دا دەسازێ . جا هەرچەند ، ئەو وێنەیەی «خۆی بێ‌هاوتا» یەمان پڕ ژیان‌تر بوو ، ئەوەندە کاری خواستەکەمان بەئاسانی‌و ڕەوانی جێ‌بەجێ‌دەبێ .

کەواتە بەرەو پیری‌ی ژیان وا بڕۆرە پێشەوە ، کە لە مێشکتدا وێنەی ئەو پیاوەی دەتەوێ وەك ئەووت لێ‌بێ ، تێیدا جێ‌گیر بووبێ . کاتێکیش کە ناچاردەبیت ، شتێکی وا هەڵبژێریت لە ژیانت‌دا کە بایەخدارو گرنگ بێ ئەو ڕێ‌یە بگرە ، کە لەگەڵ وێنەی ئاواتەخوازی خۆت‌دا ، زۆرتر ڕێك‌بکەوێ .

وا ئەم ئامۆژگاری‌یە گشتی‌یانەمان پێشکەش‌کرد . ئینجا بام هەندێ پێشنیازی تایبەتی‌یش لەبابەت بەهێزکردنی خواستەوە پێشکەش‌بکەین . لەمەپێش ، بەرپەچی ئەو مەشقە ، خۆهەڵبەستەو ، دوو لە ڕووداوانەمان دایەوە ، کە پێشنیاز کرابوون بۆ ئەم مەبەسە . ئەگەر دەمانەوێ هێزی خواستمان بەهێزتر بکەین ، بام دوو بیروباوەڕ هەن ، تێ‌یان بگەین‌و مەشقیشیان لەسەر بکەین .

یەکەمیان ئەوەتا : واز لە هەندێ ڕەووشت‌و خووی کۆنمان بهێنین بۆ ئەمەی جاربەجارێك ، مەشق بە خواستمان بکەین ، بۆوێنە ، بام جۆش‌و خرۆشی دڵ ، لە ژیانمان بکەینە دەرەوە ، تەنانەت لەو

شوێنانەیشدا کە بە خراپ دەدرێن . ئەمەیش هەر بۆ ئەمەیە کە خواست بەکاربهێنین وا ڕێ بهێنین بە خووی باشەوەو بەهێزی بکەین . بۆ وێنە ، ئەگەر تۆ لەوانە بوویت کە تووشی جگەرەکێشان بوون ، جاربەجارێك بڕیاربدە ، ڕۆژەکە هەمووی جگەرە نەکێشیت . ئەمە گوناه نیە ، کە تۆ جگەرە بکێشیت . بەڵام وازهێنانت لە جگەرەکێشان بۆ ماوەیەکی کەم ، جڵەوی خرۆشی هەناوی خۆتت دەداتە دەست ، کە زۆر جاری وا هەیە سەرکێشت دەکات . لە ڕاستیدا ، کردنی فرمانێکی وا ، جاربەجارێك ، تەنیا هەر بۆ ئەمەی کە پێچەوانەی ڕەووشتو خووی خۆمان بجووڵێینەوە ، ڕێگایەکی ڕاستو دورروستە بۆ بەهێزکردنی خواستمان .

بیروباوەڕی دووەمیش ئەوەیە : کە پێویستە لەسەرمان سستی نەکەین لە بەجیٚهێنانی ئەو بڕیارانەدا کە خواست دەیاندات : باش نیە ، لەدوای بڕیاردان ، بەجیٚهێنان ، زۆر دوابکەویٚ نابیٚ ماوەبدەیت ، ئەمەلیٚ یان خرۆشی دڵ . بکەونە ناوەند «خواست»و «جیٚبەجیٚکردنی خواست»ەوە . لە ڕاستیدا جیاوازی هەیە ، لە ناوەند ئەوەدا کە بیرێك لە هۆشتدا پێك بهێنیو ، پاشان ئەو بیرە ببەستیەوە بەو ناوچاوانەوە لە مێشکتدا ، کە دەسەڵاتیان هەیە بەسەر ماسوولکەو ئەندامەکانماندا . بەستنەوەی بیرەکە بە مێشکەوە ، بیٚگومان ، کردەوەیەکی بەهێزترو کاریگەرترە ، ئەو بەستنەوەیە ، لە مێشکدا ، کارێکی گرنگ دەکات . جا ئەگەر هاتوو ئێمە هەموو خواستێکی خۆمان جیٚبەجیٚکرد ، ئەوساکە کەرەستەی هەرەگەورەو باش ، بۆ ساختمانی ڕەووشتی بڵندمان ئامادەکەین .

شتێك ماوە قسەی لیٚ بکەین . پاش ئەمەی بەووردی هەموو ڕاستیەکت خستە پێش چاوی خۆتو ، بڕیارت دا لەسەر شتێکی وا ، کە بەلاتەوە ، لە هەموو بارێکەوە چاکترو دورروستتر بوو ، لەسەر قسەی خۆت بڕۆو ببەرە سەر جا ئەگەر لەپاش ئەوە ، بۆت دەرکەوت ، کە بەهەڵەدا چوویت ، بە دڵتەنگیەوە کاتی خۆت بەخت مەکە . جا ئەگەر بۆت روون بووەوە ، کە بەراستی بەهەڵەدا چوویتو ، لەتوایشتندا هەیە هەڵەکەت ڕاستبکەیتەوە ، ئەوا چەندت پیٚکرا ، ئەو هەڵەیەت ڕاستبکەرەوە ، بەڵام ئەگەر هاتوو هەموو شتێك بڕابووەوەو هیچ چارەیەك نەمابوو بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەکەت ، ئەوا پێویست ناکات بەوەی سەری خۆت گێژبکەیتو دڵی خۆت بڕەنجێنی ، بەو بیرەی کە ئەمەی ئێستا دەیزانیت ، ئەوسا بتزانیایە ، بڕیارێکی ترت دەدا ، گەلێك پیاوی وا هەبووە ، بەم ڕەووشتە دوابڕاوە ، خۆیان سەرگەردان کردووە . ئەوە کردەوەیەکی هیچو پووچە ! نەکەیت لێت بوەشێتە ! کەسمان تێدا نیە ، هەڵەی نەکردبیٚ ، ئەوی لەدەستمان دیٚ ئەوەیە کە تا دەتوانین بە پاکیو دورروستیەوە بڕیاری خۆمان بدەین ، لە سنووری ئەو ڕاستیانەدا ، کە کاتی بڕیاردان لە بەردەستماندان . تاکو ، ئەگەر لەپاشدا هەموو شتێك گۆڕرا خراپی ، بیانوومان بەدەستەوە نەمێنیٚ خۆمان تاوانبار بکەین .

هەرچیەکمان لەدەست هات کردمان . تەنانەت ، ئەگەر فریشتەیش بین ، لەوەندەمان زۆرتر لیٚ داوانا کریٚ .

«خواست»یش ، هەروەکو بیرو دەروون ، بۆیەکا دورروست کراوە ، کە بەکاربهێنریٚ .

دیسانەوە ، بۆیەکا دوورووستکراوە ، هەروەکو ئەو دووانە ، بە ئازایەتیو باوەڕ بە خۆ کردنێکەوە بەکاربهێنریٚ .

## پوختەی بەش

١ – خواست یاخود ویستن ، کردەوەیەکی سووروشتیە لە کردەوەکانی هۆش .

٢ – خواستیش وەك هەموو کردەوەکانی تر ، بەوە بەهێزدەبیٚ ، کە بخرێتە گەڕو مەشقی پیٚ بکریٚ .

٣ – هەتا وێنەی (دەروونی بیٚ هاوتامان) لەناو مێشکماندا باشتر دەربکەویٚ ، بۆ ئێمە خواستو نیازکردن لە ڕێگای ئاراستەوە ئاسانتر دەبیٚ .

٤ – پێویستە ، بەجیٚهێنانی بڕیار ، لەپاش بڕیاردان تاوێك دوا نەخەین .

٥ – ئەگەر ئەوەندەی لەتوانابیماندا هەیە ، مەندیو ژیریی خۆمان خستە کار بۆ ئەمەی چاکترین بڕیار بدەین ، پێویست ناکات بە خەفەت بەخۆ دان ، ئەگەر ڕاستیی ترمان بۆ دەربکەویٚ .

## هۆشی ناوەوە

### دەتەویٚ گەورە بیو گەشە بکەی ؟

**(٥)**

کردەوەکانی هۆشی ئاگادار ، بە هیچ ڕەنگیٚ ، هەموو چیرۆکەکە تەواو ناکات . چەند زۆرە ئەو کردەوانەی لە هوشی بیٚئاگا ، یاخود لە هوشی ناوەوەماندا ، هۆشێکی بیٚئاگا ، یاخود هۆشێکی ناوەوەی هەیە . دۆزینەوەی ئەم ڕاستیە ، لەبابەت هۆشی ناوەوە ، هەروەك لە بەشی دووەمی ئەم نووسراوەدا گوتمان ، لەلایەن (سیگموند فرۆید)ەوە جیٚبەجیٚکراوە . لەم چل ساڵەی دواییەدا ، بۆی لووا ، کە بکەوێتە گەڕێکی واوە کە هەرگیز نەوەستێتەوە . لە جیهانی پێشبینیی زانستی خۆناسیندا ، تا دەهات گەورەتری لیٚ دەهات .

ئاخۆ هۆشی ناوەوە چی بێ؟ دەبێ فرمانی چی بێ؟ نابێ وای تەماش بکەین، کە بریتی‌یە لە هۆشێکی دووەمی سەربەخۆ.

دەتوانین بەکورتی بڵێین: هوشی ناوەوە، هەچ راستی‌یەکی هۆش‌و هەست‌و بیرێك هەیە، کە لە هوشی ئاگاداردا نەبن، لەناو خۆی‌دا کوی‌کردوونەتەوە، هۆشی ناوەوە، لە راستیدا، کۆگایەکی گەورەی بیرەوەری‌یە.

دەتوانین، بێ‌ئەوەی خۆمان ماندووبکەین، زۆر بیرەوەری، لە هۆشی ئاگاداردا یادبکەینەوە. بە ئاووردانەوەیەکی کەم لە بیردا، دەتوانم بڵێم دوێنێ نیوەڕۆ چیم خواردووە. بەڵام هەندێ بیرەوەری، هەیە، زۆر کۆن بووە، بە گران دەدۆزێتەوە.

هەرچەندێ خۆم بکوتم‌و رەنج‌بدەم، کە بیرم بکەوێتەوە، لە منداڵیدا، کە تەمەنم دوو ساڵان بووە، چیم گوتووە، یاخود چیم کردووە، بیرم ناکەوێتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، هەچ شتێکان لێ رووبدات لە ژیانماندا، بەتەواوەتی لە هۆشمان‌دا وون نابێ.

لە راستی‌دا ئەوڕ ووداوانە هەموویان لە جیهانی بیرەوەریی هوشی ناوەوەدا کۆدەبنەوە، کە دەرگاکەی تەنیا بەهۆی «خواست»ەوە ناکرێتەوە.

(فرۆید)، ئەو بیرەوەری‌یە سەرەتایی‌یانەی منداڵی‌یە، کە دوورکەوتوونەتەوە لەو دیو هوشی ناوەوە، ئەنجامە گرنگەکانی دۆزیونەتەوە. چونکە ئێمە کە دەست‌دەکەین بە ژیان، هۆگری سرەوت‌و خوشی‌و بەزم‌و رەزم‌و دەبین. یاخود بەواتەی (فرۆید)، ئێمە کە دەست‌دەکەین بە ژیان، هۆشی منداڵیمان دەکەوێتە ژێر چنگی «ئارەزووی خۆش رابواردن»ەوە.

منداڵ هەر ئەوەی دەوێ، کە خۆش رابوێرێ‌و لەش خوش‌و بێ وەی بێ. ئەو لە چاوی خۆیەوە، سەیری شت دەکات، نەك وەك هەیە لە راستیدا. بەڵکو وەك دەیەوێ وابێ. ئەمە وایە، تا منداڵەکە گەورەدەبێ، ئەوساکە هێواش هێواش، لە دەروونیدا بیروباوەرێکی تر پەیدادەبێ، کە بریتی‌یە لە «بیروباوەری ئەو راستی‌یەی هەیەو رووی‌داوە».

کە ئەم بیروباوەرە تازەیە، وای لێ‌دێ جێگا بۆ خوی بکاتەوەو باش خۆی دابمەرزێنێ لە دەروونی مرۆڤ‌دا. مرۆڤەکە وورده، وورده لەدەست چنگی ئارەزووی سرەوت‌و بەزم‌و رەزم رزگاری دەبێ‌و، ئارەزووی بەو خوشی‌یەدا دەچێ، کە لەپێناو چاکەی گشتی‌دا یاخود گەیشتن بە ئاواتی بڵندی خوی‌دا، دەستی‌دەکەوێ، بام ئەو رەنج‌و کۆششەیشی پڕ بێ لە ئەرك‌و ئازارو خەم‌و خەفەت.

ئیتر لەوە بەدواوە، لە چاویلکە چاوو راوکەرەکەی ئارەزووی خۆیەوە سەیری جیهان ناکات، چونکە وای لێ هاتووە کە لە راستی‌ی هەموو شتێك تێ‌بگات. هەموو شتێك وەك هەیە لە راستی‌دا وەهای ببینێ.

بەم رەنگە گەشەکردنی مرۆڤ لە بابەت هۆشیەوە، تا ئەندازەیەکی گەورە، بریتی‌یە لە زاڵ‌بوونی بیروباوەری «راستی‌ی رووداو» بەسەر بیروباوەری «خۆش رابواردن»دا.

بەڵام بەلای (فرۆید)ەوە، بیروباوەری (خۆشی) بەتەواوەتی لەناو ناچێ. ئەمەیش بڕبڕاگەی پشتی هەموو لێکۆڵینەوە دەروونی‌یەکانی (فرۆید)ە. ئەو بیروباوەرە هەندێ جار، خۆی دەشارێتەوە، کەچی تا دەیشگەنە تەمەنی پیاوەتی‌و ژنێتی، کەم‌و زور، سەر دەردەهێنێتەوەو کێشمان دەکاتەوە بۆ ژێر چنگی سرەوت‌و خۆش‌رابواردن‌و بەزم‌و رەزم‌و بێ‌وەیی.

بیروباوەری خۆش رابواردنی، لە مرۆڤانی لەرو لاوازدا کار زۆرتر دەکات. بەڵام ئەو کەسانەی پی‌گەیشتون، تەنیا، گەوهەری راستی کاریان لێ‌دەکات. لەگەڵ ئەوەیشدا بیروباوەری (خۆش رابواردن)، تا ئەندازەیەك، هەموو کەسێکی بەهێزو بێ‌هێز کێش‌دەکات. بێ‌گومان ئەوی بیەوێ ژیانی خۆی لەسەر بیروباوەری راستی بیات‌بەرێوە، هەموو دەم تووشی هەندێ ماندووبوون دێ.

جاربەجارێکیش، کە زور بەلامانەوە گرانە، «خواست»ی شتی چاك بکەین، هەر لەبەر ئەم رازەیە. ئێمە دەزانین شتی هەرەچاك کامەیە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا، شتی هەرەخراپ هەڵدەبژێرین. تەنانەت لەو کاتەنەیشدا، کە وێنەی بڵندی دەروونمان لەبەر چاوماندایە، ئێمە ماوە دەدەین بە تەمەڵی‌و خرۆش‌و ترسنۆکی سواری سەرمان بین. دوور نیە کە بە خۆمان بڵێین «خواستمان کزە».

پێویستە هەمومان کەڵك لەو پەی‌بردنەمان وەربگرین کە ئارەزووە منداڵی‌یەکانمانە، لە دڵماندا ماونەتەوەو لەم هەموو بارانەدا دێنە سەر رێگامان، رێگامان پێ دەگرن. ئاسانە ئەمە تێ‌بگەین. بە کورتی ئەوەیە کە هێشتا بەتەواوەتی گەورە نەبووین. جا لەبەر ئەوەی کە هێشتا ماومانە گەشە بکەین، هێشتا خۆمان لە کۆتەو بەندی منداڵی‌ی کۆنمان رزگارنەکردووە، ئێستایش هەر بەدوای سرەوت‌و خۆش رابواردن‌و خۆ ماندوو نەکردن‌دا دەگەرێین.

بەکورتی، لەبەر ئەوەی کە لەدایك دەبین هوشی ناوەوەمان پێوەیە، ئەویش لەژێر چنگی بیروباوەری خۆش‌رابواردن‌دایە، زۆر پێویستە هوشێکی پی‌گەیشتووی تەواو بۆ خۆمان بهێنینە بەرهەم، هۆشێکی وایش بێ کە مەبەستی ژیانە بییات بەرێوە لەگەڵ ئەو وێنە بڵندانەی کە شایستەی ژنێکی پاك‌و بەرزن.

لەم کۆرەدا، لە خۆ تی‌گەیشتن، نرخێکی گەورەی هەیە. ئەو پیاوەی کە دڵ تەنگە بەهوی خوویەکی خراپی خۆیەوە، یان بەهۆی

ناتەواوی‌یەك لە دڵی‌دا . پشان بە گەرمی‌یەکەوە لە «خواستی کزی خۆی»و «دڵ‌خراپی‌ی خۆی» دەدوێ ، وا هەڵدەگرێ چەند هەنگاوێك بەرەو راستی بروات ، بەتایبەتی ئەگەر بۆی دەربکەوێ کە خۆی هێشتا منداڵەو ، لە گۆشەی هۆشەوە تەواو گەشەی نەکردووەو ، هۆشە منداڵانەکەیشی بۆتە گەورەی ، بە گوێ‌ی دەکات ! .

بەڵام لە هەندێ باری راست‌و گرنگ‌دا ، کە مرۆڤ دووچاری هەندێ لەش تێکچوون دەبێ ، یان لەو بارانەدا کە هۆش دەبێتە نێچیری خووەیەکی پر ئازار ، وا چاکترە کە پەنابەرێتە بەر شی‌کردنەوەی دەروون . ئەویش رێگایەکە بۆ چاك‌کردنەوەی نەخۆشی : پەزیشکی دەروونی‌یەکە یارمەتی‌ی نەخۆشەکە دەدا کە ئاوورێك بداتەوە لە بەسەرهاتی خۆی ، بۆئەمەی بزانێ چ جورە بیرەوەری‌یەکی شارراوە ، یاخود چ جورە دڵکێش‌کەرەیەکی منداڵی‌ی کۆنی هەیە . بە دزی‌یەوە تەندروستی‌و کامەرانی‌ی ئێستای لێ تێك‌دەداو ، وایشی لێ دەکات کە نەتوانێ وەك کەسێکی پێگەیشتووی گەشەکردووی تەواو بژی .

لێرەدا فرمانی پەزیشکی دەروونی ئەوەیە ، کە هەردوو چاوی نەخۆشەکەی بکاتەوە ، تا تەماشای ئەو شوێنانە بکات کە هۆشی منداڵانەکەی خەریکی تێکدانی ژیانیەتی . ئنجا لەسەر بنچینەی ئەم زانیاری‌یە تازەیە کە لەبابەت «خۆ» یەوە دەستی‌کەوتووە ، نەخۆشەکە دەتوانێ بە هۆشێکی گەشەدارەوە ، رووبەرووی شتومەك‌و کارەسات بوەستێ ، چونکە پێشەواکەی راستی‌یە .

بەڵام ئەوانەی ئاساین ، پێویستیان بەم شی‌کردنەوەیە نیە . زوربەمان ، ئەوەندەمان بەسە کە بزانین ، هەندێ خووی خۆمانە سەرمان لێ تێك‌دەدات . ئەو رەووشت‌و کردەوانەیش کە ناسازێن لەگەڵ وێنە بێ‌هاوتاکانی دەروونماندا ، لە راستی‌دا ، بەرهەمی ئارەزووە کۆنەکانی تافی منداڵیمانن ، کە هێشتا بەهۆی ئارەزووی رووبەرووبوونەوە بەرامبەر راستی‌و بەرەو پیری چوونی راستی بە شێوەیەکی پیاوانە ، نەك منداڵانە جڵەویان نەگیراوە .

زۆر جاری وا هەیە کە ئاووردانەوەیەکی لەسەرخۆی بچووك ، دەتوانێ وامان لێ بکات کە بتوانین بەدوای ئەم هۆیە کۆنە سەرەتایی‌یانەدا برۆین ، تا دەگەینە بنج‌و بناوانیان . دوور نیە ئەم کردەوە منداڵی‌یانە ، لای زور کەس ، دیارو ئاشکرا بن . ئەوە زور دیارە کە ئەو مرۆڤەی گرژدەبێ‌و هوروژم دەهێنێ ، هەروەها ئەو کەسەی بە خۆرایی ، لەبەر شتێکی پرووپووچ دەست‌دەکات بە گریان ، یان بە قاووقیژو توورەبێ‌و هاوارکردن ، ئەوەی کە هەموو دەم چاو هەڵ‌دەهێنێ بەم‌و بەوو . رقەبەری دەکات ، دیسانەوە ئەو کەسەی کە فرمانی سەرشانی خوی بەجێ‌دەهێڵێ‌و دوای تەمەڵی‌و خۆش‌رابواردنی خوی دەکەوێ ، ئەوەیش کە هەموو دەم ، لە هەموو راستی‌یەکی رەق‌و تاڵ هەڕادەکات . . . دەڵێین :

دیارە ئەمانە بەشێوەیەکی منداڵانە رووبەرووی ژیان دەوەستن . ئەو جۆرە منداڵە گەورانە لەسەر زەوی دا زۆرن . ئەوانە لە چاکترین باریان‌دا بەزەییان پی‌یاندا دێتەوە . بەڵام لە خاپترین باریان‌دا ، سەرگەردانی‌یەکی تەواو دەهێنن بەسەر کۆمەڵایەتی‌دا .

کەس ناتوانێ ژیانێکی باش‌و بەکەڵکی شایستە بژی ، تا خۆی وا ئامادە نەکات کە ببێتە مرۆڤێکی گەشەکردووی وا کە لەپێش ئەمەی دوای ئارزووی خوی بکەوێت ، دوای راستی‌یەکانی ژیان‌و مرۆڤایەتی بکەوێت .

منداڵی‌ی راستەقینە ، کردەوەی سوروشتی خۆشەویستی خۆی هەیە ، بەڵام «منداڵی گەورە» ، هیچ کردەوەیەکی وای نیە کە دڵ خۆش بکات‌و پیاو خۆشی بوێت .

ئەو جورە پیاوانە ، وەك زۆرداراتی بچووك وانە ، کۆمەڵایەتی تێك‌دەدەن . ئەوانە هەموو دەم لە ژیان دەپرسن ، : « چی دەتوانین وەربگرین ؟» . خۆپەرستی ، بۆ هەموو شتێك پاڵیان پێوە دەنێ ، بە تەواوەتی دەروونی داپۆشیون . ئەو رێگایەی گرتوویانە لە ژیان‌دا ، پرە لە ئێسك‌و پروسکی کامەرانی‌ی ژن‌و مێردی‌و ، دۆستایەتی‌و ، ئەو ئاشنایەتی‌یانەی کە لەناوچوون‌و دارزیون .

ئەوانە کارێکی وا دەکەن ، کە یارمەتی‌دانی مرۆڤانەی فەربەخش ، لەدەست نەیەت‌و سەرنەگرێ . چوونە ناو هەج دەستەیەکەوە دووبەرەکی‌و ئاژاوەی تێ‌دەخەن . ئەگەر بوونە ئەندامی کۆمەڵێکیش ، رقەبەری‌و جیاوازی‌و شەڕو شۆڕیشی تێ فڕێ‌دەدەن . ئەوانە لە هەموو میکرۆبێك خراپتر نەخۆشی دەخەنەوە .

یەکێك لەو مەرجانەی کە پێویستە بێ بۆ دامەزراندنی کەسایەتی‌یەکی باشی بەهێز ئەوەیە کە ئارەزوومان بۆ پەیدابێ بۆ گەشەکردن‌و گەورەبوون . لەم جیهانەدا ، جێگا نەماوەتەوە بۆ ئەو منداڵانەی کە هەموو دەم گڕومۆن‌و بۆڵەبۆڵ کەرن . ژن‌و پیاوی تێ‌گەیشتووی تەواو ، بە چەکی گەشەکردنی تەواوەوە ، دەچنە بەردەم ژیان . پەی بەوەیش دەبەن ، کە مافی کەسانی تر‌و کامەرانی‌یان ، کەمتر پیرۆز نیە ماف‌و کامەرانی‌ی خۆیان . جگە لەوە لە ژیان ناپرسن : « دەتوانین چی وەربگرین ؟» ، ئەوەندی لێ‌ی دەپرسن : « دەتوانین چی ببەخشین ؟» .

هۆشی بێ‌هەست ، کە «خۆش‌رابواردن» دەبیات بەرێوە ، بریتی‌یە لە دیاری‌یەك . لەگەڵ خۆماندا لەدایك‌دەبێ . بەڵام هۆشی پێگەیشتوو ، کە (راستی) دەبیات بەرێوە ، درەختێکە خۆمان دەیروێنین . بەڵام ژیانی بڵندو ، کامەرانی‌ی تا سەرو ، تەواوی‌ی مرۆڤ

لە واتا هەرە بەرزەکانیدا ، ئەوانە هەموویان ، بەری ئەو درەختە پیرۆزەن ، بە لقەکانیدا شۆڕبوونەتەوە ، بەری هیچ درەختێکی تر نین .

## پوختەی بەش

١ — هۆشی ناوەوە بریتی‌یە لە کۆگایەکی گەورەی بیرەوەری .

٢ — لەو کۆگایەدا زۆر بیرەوەریمان کۆبۆتەوە لەبابەت بەسەرهاتی منداڵی‌و بیرەکانی‌و ئارەزووەکانیەوە .

٣ — بیروباوەڕی «خۆشی» زاڵە بەسەر ژیانی منداڵی‌دا .

٤ — لەبەر ئەوەیە کە هۆشی ناوەوە لە هۆشی ئاگادار دوورترە لە پێگەیشتن‌و تەواوی .

٥ — پیاوەتی لەسەر ئەو بنچینەیە دادەمەزرێ کە بیروباوەڕی «خۆشی» بگۆڕێتەوە بە بیروباوەڕی « ڕاستی» .

٦ — هەرگیز نابینە مرۆڤی تەواو ، هەتا ئارەزوو پەیدانەکەین کە گەشەبکەین‌و گەورە ببین .

## دەروونی گەورە

لە گەنجینە بێشومارەکانی هۆشی ناوەوە کەڵك وەربگرە .

ڕەنگە زۆرکەس وا بزانێ ، بەپێی ئەوەی لە بەشی پێشوودا نووسیمان ، کە هۆشی ناوەوە بریتییە لە ژیان ، بریتییە لە سەرچاوەیەکی کزی .

لە ڕاستی‌دا لەم گومانە دوورتر نیە لە ڕاستییەوە ، لەبەر ئەوە نیازم وایە ، لەم بەشەدا ، پیشانی بدەم ، کە هۆشی ناوەوە ، دەتوانرێ بکرێ بە هۆیەك بۆ بەهێزبوون . گەلێك ڕێگا هەیە ، بۆ بەکارهێنانی هۆشی ناوەوە ، لەپێناو بەرهەم هێنانی ژیانێکی باشتردا .

پێش ئەمەی بەدرێژی لەمە بدوێن ، ڕەنگە وا چاکبێ ، کە پشوویەك بدەین ، بۆ ئەمەی ڕاستییەکی تر دەربخەین ، کە لە گرنگی‌دا گەیشتۆتە ئەوپەڕی .

ئێمە هەموومان لەوەندە گەورەترین کە بۆ خۆمان دیاریمان کردووە .

لە لێکۆڵینەوەی دەروونیدا ، هەرچی بەڵگەیەکیان بۆ دەرکەوتووە ، پەنجە دەکێشێ بۆ ئەوە . کەسی وامان تێدا نیە ، کە کەڵك وەربگرێ یاخود زۆرٌ کەمیش کەڵك وەربگرێ ، لەو کۆمەڵە کردەوەو هێزو شایستەییەی کە خودا داوێتێ بەسەرچاوەی هێزی وامان هەیە ، بەئاستەم دەستمان بۆ بردووە ، جارو باریش نەبێ دەستمان بۆ نەبردووە .

ئەوە ڕاستییەکە هیچ گومانی تێدا نیە ، لە کۆڕی پوختەی بابەتی لەش‌دا .

لە تاقیکردنەوەدا ، دەرکەوتووەو بڕیاری تەواویشی لەسەر دراوە ، کە ئەگەر مرۆڤ باوەڕو ئایین بکات بە پشتیوانی هۆشی) لە توانایی‌دا هەیە هێزو دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات ، تەنانەت لە لەشی‌دا .

ئەگەر باوەڕ بە خۆمان بکەین ، پێمان دەکرێ کێشانەیەکی گەورەتر بەرزبکەینەوە ، زۆرتر خۆمان ماندووبکەین لە فرمانکردن‌دا . بەڵام ، لە کاتی ئاسایی‌دا ، پێویستمان بەم جۆرە بەکارهێنانی هێزی لەشە نیە ، کە لە سنووری توانا تێپەڕبکات . ئێمە وا دووروست نەکراواین ، کە لە هەمووکاتێك‌دا ، پتر لە دەسەڵاتی خۆمان ، ڕەنجبدەین . بەڵام ئەم هێزە کۆماڵ کراوانەی کە چاوەڕوانییان ناکەین — ئەمە بایەخیەتی — هەموو دەم لەناو لەشمان‌دا ئامادەن ، دەتوانین ، بەهۆی جۆرە ڕەووشتێکی هۆشییەوە ، بانگیان بکەین‌و بیانخەینە گەڕ لە کۆڕی پێویستی‌ی ژیان‌دا .

جا لەبەر ئەمەی زوربەمان نازانێ هێزانە هەن ، ئەوانەی کەڵك لەم گەنجینە داخراوانە دەبینن ، بەجگار کەمن .

ئەندامی هەستپێکردنیش هەر واتا . چاوەکانمان ، دەتوانن زۆرتر ببینن لەوەندەی کە زۆربەمان ماوەیان دەدەین .

گوێچکەکانیشمان دەتوانن دەنگی وا ببیستن ، کە لە کاتی ئاسایی‌دا گوێمان لێیان نابێ . پەنجەی کوێرەکان ، ئەوەندە زوو هەست بە شت دەکەن ، ناوبانگیان دەرکردووە . ئەئامانەیش سەرسوورمانیان پێناوێ . هەمووی ، هەر ئەوەیە ، کە ئاوانە لە کاتی پێویستییەکی گرنگك‌دا ، ناچاربوون ، دەسەڵاتەکانی ناو لەشی خۆیان گەشەپێبکەن ، بۆئەمەی تا پێیان دەکرێ کەڵکیان لێ وەربگرن .

بەهۆی ئەو تاقیکردنەوە زۆرانەوە کە لە شوێن تاقیکردنەوەکانی دەروونی‌دا ڕاپەڕێنراون ، بە ڵگەی ڕاست‌و دوروست دەرکەوتووە ، کە ئەو هێزی بینین‌و گوێگرتن‌و دەستلێخستنەی هەمانە لەگەڵ گەلێك جۆرە هێزی تری وەك ئەوان ، ئەوەندە گەورەن نایەنە سنووری ئەندێشەوە . لە گەڵ ئەوەیشدا ، ئەوەندەی لەو هێزانە بەکاردەهێنرێ ، بەجگار کەمە .

دیارە ئەمەی کە لە کۆڕی دەروونی‌دا ، ڕاست دەرچووە ، ئەوەندەیش لە کۆڕی هۆشی‌دا دیسانەوە ڕاست دەرچووە . زوربەمان بریتین لە بەشێکی «خۆ» یان . بەڵام بەشەکەی تری «خۆ» یان ، نوستووە ، هەرگیز لەم جیهانەدا ئاگادار ناکرێتەوە . ئەمەندە هێزو دەسەڵاتمان هەیە ، کەم جار ، نەبێ ، نایەت بەبیرمان‌دا کە هەمان بێ .

ئەگەر ئەم گەنجینە شارراوەیە ، دەربخەین‌و بەرەڵڵای بکەین‌و بیخەینە کار لەپێناو پێکهێنانی «کەسایەتی‌ی گەورەمان» دا ، هیچمان لێ نایەت‌و کەسیش نیە بەردەستمان بگرێ .

لە کەس ناخوازم خوێ بنوێنێ ، یان خۆی هەڵبکێشێ . هەروەها لە کەسیش ناخوازم ، پتر لە پێویست ، باوەڕی تەنکك‌و شێلوو بە

خۆی بکات . لە ڕاستیدا ئەمانە بەجگار دوورن لە بیروباوەڕی ڕاستییەوە .

ئەمانە رووکەشی ئەو هێزە منداڵانەیەن کە لە بەشی پێشوودا لێ‌ی دوواین .

ئەو کەسەی باوەڕی تەواوی بە خۆی هەبێ ، خۆی هەڵنا کێشێ ، بەخۆیەوە نانازێ . تەنیا بە کارو فرمانی خۆیەوە خەریکدەبێ ، نە بەلای ڕاست‌دا دەڕوانێ ، نە بەلای چەپ‌دا . بەڵام ئەو کەسەی لە دڵدا باوەڕی بەخۆی نەبێ ، لە هەر بارێکدا بێ ، هەر دەنازێ بەخۆیەوە . هەر خۆوی هەڵدەکێشێ . ئەو بۆیەکا ، ئەوە دەکا ، کە ئازایەتی‌ی خۆی بپارێزی‌و ئاگرەکەی خۆشبکات .

زانستی خۆناسین ، واز لە بیرکردنەوەی دوورووست‌و تێگەیشتنی ئاسانی ناهێنێ . ئەو ڕەووشتە خۆهەڵکێشەی کە لەپشت خۆیەوە کە للەیەکی بۆشی شاردبێتەوە ، هەر لەو باڵۆنانە دەکات کە منداڵان یاری‌ی پێ دەکەن . ئەمەندە بایان تێکراوە ، هەر بە ئاستەم شتێکیان لێکەوت ، دەمو دەست دەتەقن .

بەڵام زوربەی کەسان ، تا ئەندازەیەکی زۆر گەورە کەم باوەڕن بە خۆیان . دەترسن لەوەی بچنە ناو کۆڕی فراوانەوەو ئەو هێزانەی کە لە دەروونیاندایە گەشەیان پێ بکەن . ئەوەندەیش بێکارەن ، ناتوانن لە نیوەی ڕاستی‌ی خۆیان‌و هێزی ڕاستەقینەی خۆیان کەڵك وەربگرن . جا بۆ ئەو جۆرە کە سانە ، زانستی خۆناسینی نوێ ، واتای تیژکەرو خوێن گەرم کەر ئاراستە دەکات .

زانستی خۆناسین پێیان دەڵێ : هەموو کەسێك زۆر لەوە گەورەترە کە بە بیریدا دێ هەر کەسێك بگری ، زیرەکی‌و دەسەڵاتی وای هەیە ، کە کەمێك نەبێ ، بەکار نەهێزاوە .

هەر کامێکیشیان بگری ، دەروونێکی بەهێزی وای هەیە ، کە زۆر گەورەترە لەوەی لە بیریدایە ، یاخود دەوێرێ بە بیری‌دا بێت .

ئاخۆ کەی کلیلێکی چاوبەستانەمان دەستبکەوێ ، تا ئەو دەرگایەی پێ بکەینەوە کە دەمانگەیێنێ بە دەروونی هەرە چاکمان ؟ .

لەناو دێڕەکانی ئەم نووسراوەدا ، لە دوورەوە ، دەستنیشانی ئەو کلیلەم دەکرد ، . بام ئێستا بە سێ ووشە بیرێنینەوە :

خوێن گەرمی ، پێشت بەخۆ بەستن ، هێنانانە پێش چاو .

لە «خوێن گەرمی» مەبەسم ئەوەیە ، جۆرە سۆزێکی وا بەکاربهێنرێ کە هێزە دەروونییەکانمان ببزوێنی‌و بیانخاتە گەڕ بۆئەمەی ئاواتی هەرە چاکیان پێ بهێنێتە بوون . خۆشەویستی ، بە هەر جۆرێك بێ ، لەو سۆزانە ، لە هەموویان ، گەورەترە .

کەسمان تێدا نیە نەزانێ ، کە دایك بەهۆی ئەو خۆشەویستییەوە کە لە دڵیدایە بەرامبەر کورەکەی ، چۆن خۆی بە ختەکاو چ جۆرە کردەوەیەکی مەردانە دەنوێنێ ، لەپێناو چاککردنەوەی کورەکەیدا ، کە نەخۆشی بەرەنگاری شەنگك‌و شۆخی‌ی بووەو مەرگ لە دوورەوە هەڕەشەی لێ دەکات . ئەو ئازایەتی‌و خۆماندووکردنەی دایك پیشانی دەدات لەو کاتانەدا ، هەر بەبیردا نایەت .

هەموو یشمان دەزانین ، کە ئەو گەورە پیاوانەی مرۆڤایەتییان خۆشدەوێ ، چ جۆرە ڕەنج‌و کۆشش‌و تەقەللایەکی مەردانەیان داوە لەپێناو* چاکەی مرۆڤایەتی‌دا . ئەوانە پێشەوای ڕەگەزی مرۆڤایەتی‌و سەرکردەو پێغەمبەرەکانی بوون .

پیاوو ژن ، ئەوەی لەدەستیان دێت ، لەپێناوی خۆشەویستی‌دا ، ئەگەر بەهۆی شتێکی ترەوە بووایە ، ئەوەیان بۆ نەدەچووە سەر .

هەروەها مەبەسم لە «پشت بە خۆ بەستن» ، ئەوەیە کە بە ڕاستی باوەڕبهێنین بە خۆمان کە دەتوانین فرمانێك بکەین ، ئەوەیش ئەو فرمانەیە کە هەستدەکەین بەوەی پێویستە بیکەین . .

پوختەی ئەمەیش ئەوەیە ، کە ترسنۆکی‌و باوەڕ بەخۆ نەکردن ، لە دڵمان فڕێ بدەنیە دەرەوە . جگە لەوە حەز بە پیرەوەچوونی ژیان بکەین بە ڕوویەکی ئازایانەوە ، لەگەڵ باوەڕکردنیش بە خۆمان‌دا ، بە هیواو ئاواتەوە تێبکۆشین بۆئەمەی بگەنیە دوو ئامانجی گرنگك : [خۆناسین] و ، [گەشەکردن بە خۆ] . ئەوەتا بڕیاری پێشەوایانە ؛ بۆئەمەی زۆرترین کەڵك لە خۆمان وەربگرین ، نەك هەر بۆ مەبەسی تایبەتی‌ی خۆمان ، بەڵکو بۆ مەبەسی گشتی‌و تایبەتی ، شانبەشانی یەکەوە .

بەڵام لە «هێنانە پێش چاو» ، مەبەسم ئەوەیە ، کە وێنەی ئەو پیاو یاخود ئەو ژنەی دەمانەوێ ئەو بین ، هەموو دەم لە پێش چاومان‌دا بێ : هەموودەم وێنەی بێهاو تای خۆمان بهێنینە پێش چاومان . «وێنە هێنانە پێش چاو» ، بەم واتایە ئەوە دەگرێتەوە ، کەبەتەواوەتی پەی ببەین بەو ئامانجانەی کە بەتەنگەوەین بیانگەیێنێ ، بەو ئاواتانەی کە ژیانمان دەخەنە سەر ڕێ ، بەو شتانەی کە ڕەنجی بۆ دەدەین‌و بەکەڵکی دێین هیچ گومان لەوەیشدا نیە ، کە ئەم سێ شتە : «خوێن گەرمی» و «پشت بە خۆ بەستن» و «هێنانە پێش چاو» ، هەر سێکیان پێکەوە بەندن ، نووساون بەیەکەوە . لە توانایشمان‌دا هەیە کە گەشەیان پێ بکەین ، ئەگەر پەیڕەوی‌ی ئەو ئامۆژگارییانە بکەین کە لەم نووسراوەدا خوێندوومانەتەوە . بەتایبەتی ئەوەی کە لە بەشی دووەم‌و سێیەمی ئەم نووسراوەدا پیشاندراوە لە بابەت «ئارەزوو» و «سۆز» ەوە زۆرگرنگە ، لەبابەت بەکارهێنانی هێزەکانی هۆشی ناوەوە ، لەپێناو گەیشتنمان بە ژیانێکی چاکتر ، چەند قسەیەك هەیە ، وا چاکە ، لەپێشەوە ، بکرێ . ئەوەیش بەهۆی شتێکەوە جێبەجێ دەکرێ ، کە هونەر ناوی ناوە «نیاز بە خۆ بەخشین» .

«نیاز بە خۆ بەخشین» یش لەسەر ئەو بنچینەیە دامەزراوە ، کە

«هەر بیرێك گەیشتە ناو هۆشی ناوەوە ، خەریکدەبێ خۆی بهێنێتەدی» .

ئەویش لەبەر ئەوەیە ، کە هەروەك ئارەزووەکانو بیرە منداڵییە بەهێزو هەرەتەکانمان کە لە پەراوێزەکانی هۆشی ناوەوەدا دەژین ، هێشتا هەر رامانده‌کێشن بۆ خوارەوە ، هەروەها بیرەکانو ئارەزووە تازەکانیش کە دێنە ناو پەرستگای هۆشی ناوەوە ، دەتوانن لەوێدا بژینو بە جۆرێکی نوێ رامان بکێشنەوە . بێجگە لەوە دەیشتوانین هەموو هێزەکانی هۆشی کۆبکەنەوەو بیانخەنە گەڕ بۆئەوەی بێنەدی .

بەڵام لێرەدا شتێك هەیە . ئەگەر بمانەوێ ئەم بیرو ئارەزووە تازانە بەربدەن ، پێویستە بە ناخی هۆشی ناوەوەدا بچە خوارەوە .

بام ئێستا هەندێ وێنەی پرۆپووچی ساکار بهێنینەوە ، بۆئەمەی بەجۆرێکی رووداوو بەرجەستە ئەم کەینەو بەینەیە روونبکەنیەوە .

لێردا کچێکی جوان دەبینین ، بە ددانی نینۆکی خۆی دەقرتێنێ .

ئاخۆ ئەم کچە ، چی بکات باشە . بۆ ئەمەی لەم خووە ناشیرینە رزگاری ببێت ؟ . لەپێش هەموو شتێکدا ، پێویستە لەسەری ، لە سووچی هەستەوە ، بۆ چارەکردنی ئەم خووەی بێتە پێشەوە پێویستە لەدڵی‌خۆیدا بڵێ‌ی پێی‌ی لێبنێ . کە ئەو خووە نەنگكو پیسە ، رەووشتێکی ناشیرنیە کەس حەزی لێ ناکات . چونکە پێچەوانەی رەوشتو خووی کۆمەڵایەتییە . پێویستە بە خۆی بڵێ : ئەوەوەندەی فرمانێتی بەرامبەر خۆی ، هەروەها فرمانێتی بەرامبەر ئەمو ئەو ، کە تا پی‌یبکرێ باشترو پاکترو جوانتر خۆی دەربخات . پێویستە زۆر بەپەرۆشەوە پەی بەوە ببات‌و ، ئەو پەی‌پێبردنە کار لە دڵی بکات ، کە پەنجەکانی وا پیس‌و ناشیرینیان لێ هاتووە ، هەرکەسێ دەیانبینێ ، دڵی لێیان تێك هەڵدێ‌و بێزیان لێ دەکەنەوە . پێویستە لەسەری وێنەی دەستەکانی بێنێتە بەرچاوی کە چەند جوانو رەنگین دەبن ، ئەگەر خەمی نینۆکەکانی خۆی، بخوات‌و بەجوانی خشتیان بکات‌و بە رەنگی پەسەند ، رەنگاو رەنگیان بکات . پێویستە لەسەری بڕیار بدات ، کە خۆی لەم خووە نەنگە رزگار بکات ، کە شایستەی جوانێکی وەك خۆی نیە . پاشان، پێویستە بە خۆی بڵێ : بە هەموو پشت بە خۆ بەستن‌و هیوایەکەوە : لە تواناییدا هەیە ئەم بڕیارەی خۆی بباتەسەر ، چونکە لە ووزەی‌دا هەیە بیکات .

ئەوانە دەرگای چوونە ژوورەوەی هەستن بۆ کەینەو بەینەکە .

بێگومان بۆت دەرکەوت ، کە کۆڵەکەکانی فرمانەکە لێرەدا ، بریتین لەو سێ ووشەیەی کە لە کەرتێکی پێشووی ئەم بەشەدا ، ناومان بردن :

«خوێن گەرمی» و «پشت بە خۆبەستن» و «هێنانە پێش چاو» .

بەڵام ، رەنگە ئەمانە ، هەموویشیان بەکەڵك نەیەن . بەڵێ وایە . دوور نیە کچە کە نەتوانێ زاڵ‌بێ بەسەر خووی نینۆك کرۆستن‌دا ، لەگەڵ ئەو بڕیارە چاکەی‌و نیازە راستەی‌دا . ئەوەش ، لەرووی زانستی خۆناسینەوە ، رەنگە لەبەر ئەوەبێ ، کە بیرو باوەری [خۆش رابواردن] ی کۆن ، ئەوەندە لە هۆشی ناوەوەی‌دا جی‌گیر بووە ، بیروباوەرە تازەکە ، کە بریتیە خۆی زاڵ نابێت بە سەریدا بێکانە دەرەوە لە هۆش‌و «راسبی» ، لەیەر کزی‌ی لە ئی‌ی ئەودا جی‌ی خۆی بکاتەوە .

لە بارێکی وادا ، کچەکە دەتوانێ شێوەیەکی تایبەتی بەکاربهێنێ ، بۆ دەرپەڕاندنی بیرباوەری ٤خۆسی] یەکە لە نیشتمانەکەی خۆی‌دا ، واتا لە هۆشی ناوەوەدا . دەتوانێ هۆشی ناوەوە بخاتە سەر ئەوەی کە خۆی رەاست‌بکاتەوە . ئەوەیشی بەو شێوەیە بۆ پێکدێ کە پی‌ی دەڵێن : «نیاز بەخشین بە خۆ» . پێویستە لەسەری ، هەرچەند چووە ناو جێگاوە بنوێ ، پاش ئەمەی لەشی خۆی دبێ حەساوەتەوەو ، هۆشی ئارامی پێ گەیشتووەو ، خەویشی خەریکە بڕژێتە ناو چاویەوە ، بێئەمەی بهێڵێ خەزەکەی لێ بزرێ ، زۆر بە ئەسپایی‌و شیرینی ، ئەم ذستانە پانزە — بیست جار بۆ خۆی دووبارەبکاتەوە :

«هەندێکی پێ چووە نینۆکی خۆم نەکرۆشبووە . ئەم ماوەیە رۆژبەرۆژ .ارێژتر دەبێتەوە . رۆژبەرۆژ ئەم خووەم کزتری لێ‌دێ . نینۆکەکانم خەذیکن جواندەبن . ززری پی‌ـناچێ ، دڵم بە هەردوو دەستەکانم خۆشدەبێ ، چونکە بەهۆی پەروەرەدەکردنێکی چاکەوە ، تا یەن جوانتر دەبن .»

دەبێ ئەم قسانە بە سرپە بخاتە دەروونی خۆیەوە ، لەوکاتەاا کە خەو دەبابەوە نابێ بهێڵێ ، ووریا ببێتەوەز خەوەکەی کێ بزر یێ . ئەو پەر ەکەی بیسب جار ، دووبارەیان بکاتەوە ، بەسە .

پاشان خۆی بداتە دەست خونکاذی نووستنی زەبر بەدەست . بەڵام ئەگەر هاتوو خەوی لێکەوت ، چێش ئەمەی بتوانێ قسەکام بیست جار دووبارەبکاتەوە ، لەوە باشتر میە

پێویستە . کچەکە ، ئەم شێوەیە ، لە هەموو شەوێك‌دا ، دووبارەبکاتەوە ، تاچەمد مانگێك . هیچ پێویست نیە ، لە کاتی هۆشیاری‌دا ، بیرلەم چەندو چوونە بکاتەوە . هەر ئەوەندەی لەسەرە ، کە ئەو کردەوانەی هۆشی ناوەوەدا دەستیان‌پێدەکرێ ، رێگایان بۆ بەرەللا بکات ، لە رێ‌ة خۆیانەوەو لەسەذ شێوەة نهێنی تایبەتی‌ی خۆیام جی‌بەجێ ببن . کچەکە ئەگەر ئەوەی کرد ، ئەوە دەگەیێنێ ، ئەو هێزانەی لەناو هۆشی خۆی دا بەکاریان دەهێنێ ، قووڵتذو جوانترن لە بیرکردنەوەیەکة ووردو هێزی خواستی ئاسایی ، . بەڵێ ، هۆشة ناوەوە ، هێزێکی واهە ، کە چەندو چۆنی لەسەز بکەی .

ئەوە تا نیاز بە خۆ بەخشین . لە توانایشدا هەیە ، گیروگرفت‌و

تەنگوچەڵەمەی گرنەکبرو گەورەبر لە نینۆك کرۆشتن چارەبکان ! . .

هەر ژن‌و پیاوێك ، توانی ، بە هونەرمەندیی ، خۆی پێوەندی خووە کۆنەکانی خۆی بپچڕێنی ، بۆئەمەی بلند ببێتەوە بۆ دەروونێکی چاکترو پاکتر لە دەروونی خۆی ، ئەو کەسە ، خاوەنی بلندترین ئاسۆوو فراوانترین کۆڕە لە ژیانیدا .

هەرچەندە سێ سووچکەی «خوێن گەرمی» و «پشت بە خۆ بەستن» و «هێنانە پێش چاو» ، نووساون بە هۆشی ئاگادارەوە بەڵام «نیاز بە خۆ بەخشین» بێ ئەوان هیچی پێ ناکرێ .

لەبەر ئەوە بە باشمان زانی لێرەدا سەرنجی خوێندەوار رابکێشین .

لەبەر ئەوە هەروا چاکە : (نیاز بە خۆ بەخشین) لەگەڵ ئەم سێ سوچکەیەدابێ ، بۆئەمەی هێزەکەی پتربکات‌و ، ئەو کارە ، لە جیهانی هۆشی ناوەوە بکات ، کە هۆشی ناوەوە ، لە جیهانی هۆشی ئاگاداری دەکات .

بەلایشمانەوە وایە ، کە درترین جۆری خووەکانز سەرنەکەوتن لە ژیاندا ، ناتوانێ بەرامبەر ئەو پاچە گەورەیەدا بوەستێ کە مرۆڤ کرتوویە بەدەستیەوەو دەیوەشێنێ .

چونکە ئەو پاچە دوروستکراوە کە کۆمەڵەی «نیاز بەخشین بە خۆ» و سێ سووچکەی «خوێن گەرمی» و «پشت بە خۆ بەستن» و «هێنانە پێش چاو» کە هەموویان بۆ لایەك ئاراستەکراون .

بەڵێ ئەوە هێزێکی گەورەیە ، هیچ شتێك بەرگەی ناگرێ . . .

**پوختەی بەش .**

(١) – هەر کامێکمان بگریت ، دەروونێکی گەورەترو فراوانتری هەیە لەوەی کە لەوە پێش بۆی دەرکەوتووە .

(٢) – «خوێن گەرمی» و «پشت بە خۆ بەستن» و «هێنانە پێش چاو» ، ئەو کلیلانەن کە یارمەتیمان دەدەن لە دۆزینەوەی «دەروونی مەزن» دا .

(٣) – «نیاز بەخشین بە خۆ» ، وەك داردەستێکی چاو بەستانە وایە ، کە کەوت لە هێزە شارراوەکانی ناو هۆشی ناوەوە ، هێزێکی وا دەخاتە گەڕ بۆ فرمان بینین‌و چارەکردنی گیروگرفت‌و تەنگوچەڵەمە ، کە نە بېڕێتەوە ، نە ئەندازەیشی هەبێت .

**پەراوێز**

(١) – ئەم وێنەیە هی نووسەر نیە . بۆیەکا وامان هێنایەوە کە لە تێگەیشتنی کوردەوارییەوە نزیکتر بێت .

(٢) – شێلوو = قوولییەکی کەم .

# رووباری جانغی تاوانی هەزارەکان دەشواتەوە

گێڕانی: فریا جاف

دوورگەی ساغاری گۆشەگیر هەتا دەوروبەری چواردەی کانونی دووەم بەبێ هیچ چالاکی‌یەکی مرۆڤایەتی جۆر بەجۆر بە بێ بەش دەمێنێتەوە . لەو مێژووەوە (٣٠٠) هەزار حاجی هندۆسی لە رووباری (جانغ)ی پیرۆزدا بۆ شۆرینەوەی تاوانەکانیان مەلە دەکەن چونکە بروایان وایە کە ئەمە رێگای ئاسمانیان بۆ خاوێن دەکاتەوەو گیانەکانیش لە خولی پەیتا پەیتا لەدایگ‌بوون لەسەر زەوی رزگاریان دەبێت .

ئیمرۆش دوا رۆژی مانگە لە (بواس)و حاجی‌یەکانیش پۆل پۆل لە هەموو جێگایەکی هیندستانەوە روودەکەنە ئەو دوورگەی کەوتووەتە سەر دووری (١٠٠) میل لە کەلکەتای پایتەختەوە .

ئەم دوورگەش دەکەوێتە سەر دووئاوانی رووباری جانغ لە کەنداوی «بنغال» ، بە پێی بیروباوەڕی هیندۆکی‌یەکان خاوەن شکۆی ئاسمان (أندرا) ئەسپێکی لە خاوەن شکۆ «ساغار» لە جێگایەکی پەرستگای کابلسمونی -لە دوورگەی ساغاردا شار دوەتەوە ، دوای ئەمە خاوەن شکۆ (٦٠) هەزار کوری وەك بارمەتە لە بنەماڵەی ئەندار گرتووەو دوایش کردوونی بە خۆڵەمێش ، بەڵام خاوەن‌شکۆی ئاسمان پاش ماوەیەکی کورت پەیمان زیندوو کردنەوەو لێبووردنی زوربەیانی داوەو حاجی‌یەکانیش بە پیرو گەنج‌و هەژارو دەوڵەمەندیانەوە بەرووتی‌و نیوە رووتی خۆیان دەخەنە نێو ئاوی رووبارەکەوەو دەنگی مایکرۆفۆنەکانیش بەرز دەبێتەوەو بەبێ وەستان ناوی گوومبووەکانی ناو حەشامەکە رادەگەیەنێ .

لێرەشدا بە سەدەها کرێکار هەن کە ئیش‌و کاریان کۆکردنەوەی پیسی ناو پەرستگاکەیە .

# خشتەی لێکدان بە پەنجە

• عزیز مەلا احمدی رەش •

جاران لەناو فەقێی مزگەوتاندا بۆ زانینی ئەنجامی لێکدانی دوو ژمارە لە جیاتی خشتەی لێکدان واتا (جدول الضرب) کە ئێستا منداڵانی قوتابخانە لەبەری دەکەنو بەهۆیەوە زوو بەزوو ئەنجامی لێکدان دەزانن ، ڕێگەیەکی تایبەتی بەکاردەهات ئەویش ڕێگەی لێکدانە بە پەنجەکانی دەست .

جا بۆ ئەوەی نەوەی ئەمڕۆمان لە ڕابردووی نەوەکانی پێش خۆی ئاگاداربێت ، وا ڕێگەکە بلاودەکەینەوە .

بەو شێوەیەی کە ماموستا عزیزی مەلای ڕەش لە هەولێرەوە بۆی ناردووین .

«ڕۆشنبیری نوێ»

(خشتەی لێکدان بە پەنجە

لە ژمارە ٦ تا دەگاتە ژمارە ١٠

پێشەکی هەر پەنجەیەك ژمارەیەکی بۆ دادەنێین بە مەرجێك لە ژمارە شەشەوە دەست پێ دەکرێت بەم شێوەی خوارەوە :-



٧ × ٨ بۆ وێنە بەم جۆرەیە :-

لە دەستێك پەنجەی ژمارە «٦ ، ٧» دەنووشتێنینەوە لە دەستەکەی ژمارە «٦ ، ٧ ،٨» دەنوۆشێنینەوە .

هەر پەنجەیەك کە نووشتابەوە بە «٥» حیساب دەکرێت ئەو پەنجانەی کە ماونو نەنووشتاینەوە لێك دەدرێت . ئەنجامەکە دەردەچێت بەم شێوەیە :-



پەنجە نووشتاوەکان لە هەردوو دەست پێنجن واتە :-

«٥ × ١٠ = ٥٠» . ئەو پەنجانەی کە نەنووشتاینەوە لە یەکیان سێنەو لەوی تریان دوونە واتە :-

«٣ × ٢ = ٦» ئەنجامەکە «٥٠ + ٦ = ٥٦» .

٨ × ٩ لە دەستێك پەنجەی ژمارە «٦ ، ٧ ،٨» دەنووشتێنینەوە . پەنجە نووشتاوەکان لە هەر دوو دەست «٧» دەکات واتە «٧ × ١٠ = ٧٠» ئەو پەنجانەی کە ماون لە یەکیان دوونە ولەوی تریان یەکە واتە :

« ٢×١ =٢» ئەنجامەکە «٧٠ + ٢ =٧٢» ئیتر هەروەها

Roshinbiry Nwe
General Cultural Monthly Magazine
Issued by: Kurdish Culture and Publication House
Ministry of Culture and Information
Baghdad - Iraq

روشنبيري نوى
مجلة ثقافية شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية ساحة الجلاني بغداد
تەلەفۆن ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

نرخي ١٠٠ فلسه

ئەم ژمارەیە ٨٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

مسجلة بدائرة البريد برقم ١١٩

مطبعة الاديب البغدادية هاتف 8881232